

# ناوەرۆک

## تەوەری ژمارە:



## بابەتی گشتی:







تەوەری داهاتوو

# ڕەوشی توێژینەوە ئەکادیمیی و کۆنفرانسە زانستییەکان و ڕۆڵیان لە پێشخستنی کۆمەڵگەدا

لە دەیەی ڕابردوودا پێشکەوتنێکی بەرچاو لە بواری توێژینەوەی زانستیدا بە هەموو جۆرەکانییەوە هاتە ئاراوە، چی نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا بێت، یاخود توێژینەوەی پلەبەرزکردنەوە و بەشداریکردن بێت لە کۆنگرە و کۆنفرانسە زانستییەکاندا. ئەم حاڵەتە بە هەردوو باری ئەرێنی و نەرێنی لە ناوەندە زانستییەکاندا لێکدەدرێتەوە و تەماشا دەکرێت، بۆیە خاڵ دەیکاتە تەوەری سەرەکی و دەخوازێت وەڵامی ئەم پرسیارانە لە توێژەران و ئەکادیمییانەوە وەربگرێت:

ـ ڕەوشی نامە زانستییەکان و توێژینەوە ئەکادیمییەکان چۆن دەبینیت و هەڵدەسەنگێنیت؟

ـ هەتا چەند زانکۆ و ناوەندە ئەکادیمییەکان و سەنتەرەکانی توێژینەوە بەشداریی پرسە گرنگەکانی کۆمەڵگەیان کردووە؟

ـ پێوەرە زانستییەکان لە نووسین و هەڵسەنگاندن و گفتوگۆی ئەو توێژینەوانەدا هەتا چ ئاستێک ڕەچاو دەکرێن؟

ـ ئایا هەموو توێژینەوە زانستییەکان لە ئاستی بەرزدان؟ یان ڕووکەشی و ڕووپامایی زاڵە بەسەریاندا؟

ـ ئەی توێژینەوەی جددی و قووڵ کە ئەنجامی باش پێشکەش دەکات، بۆچی بەهەند وەرناگیرێت؟

ـ هەتا چەند لایەنە پەیوەندیدارەکان و دامودەزگا فەرمییەکان گرنگی دەدەن بە ئەنجام و ڕاسپاردەی توێژەران؟

ـ هۆکار چییە هەماهەنگی لە نێوان زانکۆکان و دامودەزگا جۆراوجۆرەکاندا نییە؟

ـ ئای کۆنفرانسە زانستییەکان بوونەتە جێگای خۆنمایشکردن و وێنەگرتن یان جۆرێک لە گەشتکردن یاخود بەهای زانستییان ماوە و کاریگەرییان هەیە؟

ـ نامە زانستییەکانی ماستەر و دکتۆرا هەتا چەند بە زانستییانە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت؟ ئایا فاکتەری کەسی و دەروونی ڕۆڵیان لە هەڵسەنگاندنیاندا هەیە؟

. داوا لە نووسەران و شارەزایانی بەڕێزی ئەم بوارە دەکەین، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی، کە ئاماژەیان پێدراوە هەتا ڕێکەوتی (٢٠٢٤/١٠/١) بۆ گۆڤارەکەمان بنێرن.

تەوەری ژمارە

# فرەفەتوایی و کاریگەرییەکانی لەسەر کۆمەڵگە

چارەسەرێک وا خەریکە ئەمڕۆ دەبێتە گرفت لە کوردستاندا، زۆربوونی فەتوا و ناکاملی بەشێکی فەتوادەران و قۆستنەوەیەتی بۆ مەرام و بەرژەوەندی کەس و گرووپ، چونکە فرەفەتوایی لەبەرئەوەی جاران بابەتییانە و دوور لە هەر کارییگەرییەکی دەرەکیی و بەرژەوەندی کەس و گرووپ بوونی هەبوو، ببووە مایەی ڕەحمەت و ویسعەت بۆ ئوممەت، بەڵام ئەمڕۆ بشێوییەکی گەورەی لە کۆمەڵگەدا لێکەوتووەتەوە، بە ئەندازەیەک فەتوای زانایان قورسایی جارانی نەماوە و ئەگەر کەسێک فەتوایەکی بەدڵ نەبوو، فەتوایەکی دیکە دەدۆزێتەوە.

هەربۆیە تەوەری ئەم ژمارەیامان بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکرد و داوامان لە کۆمەڵێک مامۆستا و شارەزای بوارەکە کرد، شەنوکەوی وردی فەتوا و موفتی و مەرجەکانیانمان بۆ بکەن، هەروەها لێکەوتەکانی فرەفەتوایی و مەرجەعمان بۆ بخەنەڕوو، کە تا چەند کاریگەری جێدەهێڵن لەسەر کۆمەڵگە و لێکترازان و پەرتبوون ناقۆلاتر دەکەن، ئەوانیش بەڕێزەوە لە چەند ڕوویەکەوە لە بابەتەکەیان کۆڵیوەتەوە، باسی سەرەتای فەتوا و گەشەکردنی و قۆناغەکانیان خستووەتە ڕوو، چارەسەریشیان بۆ ئەو پاشاگەردانییە کە ئەمڕۆ کۆمەڵگەی گرتووەتەوە پێشنیاز کردووە.

بەو ئومێدەی توانیبێتمان پەنجەمان خستبێتە سەر برینەکە و خوێنەری بەڕێز سوود لەو بیروڕا و توێژینەوانە وەربگرێت، کە نووسەرە بەڕێزەکان پێشکەشیان کردوون.

گۆڤاری خاڵ

بۆ قسەکردن لەسەر ئەم پرسە پێویستمان بە شرۆڤەکردنی چەند چەمکێکی ناونیشانەکە هەیە. یەکەم: فەتوا چییە و مەرجەکانی چین؟ فەتوا لە زمانی عەرەبیدا ئیسمی مەصدەرە، لە فرمانی (أفتى يفتى) واتە ڕوونکردنەوەی بڕیار، مەبەست لە ئیسمی مەصدەر ئەوەیە کە دەبێت کارەکە هەبێت ئینجا ئەوەی کە پەیدا دەبێت لەو کارە ناوێکی بۆ دادەنرێت، کە لە ماددەی فرمانەکە دروست دەکرێت، واتە کە کەسێکی زانا بڕیاری لەسەر وەسفی شەرعی کارێک دا ئەو بڕیارە ناودەنرێت (فەتوا)، یان (فوتوا)، بەڵام لە زاراوەی زانایانی شەریعەتدا فەتوا بریتییە لە دیاریکردنی وەسفی شەرعی کارێک و دەرەنجامی ئەو وەسفە لە بەرپرسیارێتی، واتە ئەگەر کەسێک بە هۆشیاری خۆی و بەبێ بوونی گوشار و زۆرلێکردن و بەبێ بوونی پاساوێکی گونجاو، قسەیەک یان کارێکی کرد پەیوەست بە خۆی یان ئەوی تر لە بابەتە جیاجیاکانی ژیانی ڕۆژانەیدا و ئینجا خودی کەسەکە یان کەسێکی تر بیەوێت بزانێت ئەو قسەیە، ئەو کردەوەیە لە ترازووی هەڵسەنگاندنی شەرعیدا چ نرخ و بەهایەکی هەیە و لەڕووی بەرپرسیاریەتییەوە چ لێپرسینەوەیەک ڕوو لە خانەوادەکەی دەکات، ئەم پرۆسەیە پێی دەگوترێت: ئیستیفتا و ئیفتا و بڕیارە کۆتاییەکەش دەبێتە فەتوا.

کەواتە هەموو فەتوایەک پێویستی بە سێ ڕەگەز هەیە: موستەفتی (پرسیارکەر)، موفتی (فەتوادەر)، بابەتی فەتوا (کە ڕەنگە قسە یان کردەوە یان مامەڵەیەک بێت)، سەبارەت بە موستەفتی دەگونجێت هەرکەسێک بێت و هەموو کەس بۆی هەیە پرسیار لە کاری خۆی و کاری ئەوی تر بکات، موفتیش ئەو کەسەیە کە خاوەنی بڕوانامەیەکی متمانەپێکراوی شەرعی بێت، بە جۆرێک کە مافی فەتوادانی پێ بدات نەک هەرکەسێک هەستا و هەندێک ئایەت و فەرموودەی لەبەر بوو، یان قسەزان و لەبلەبان بوو، یان سیمایەکی ئایینی پێوە بوو، یان ماوەیەک لە حوجرە و مزگەوت خوێندبووی، یان واعیزێکی باش بوو، لێمان ببێتە موفتی و بڕیاردەری کاروباری ئایینی، کە دیارە پلەی موفتی پلەیەکی بەرز و بایەخدارە و بە ئاسانی مرۆڤی ناگاتێ و پێویستە لەلایەن زانایانی وڵاتەوە کەسی بۆ کاندید بکرێت و دەسەڵاتی سیاسیی وڵات بڕیاری لێ بدات.

بەشێکی بابەتەکە پەیوەستە بەوەوە لەسەر ڕووداوەکان کێ دەبێ فەتوا بدات، خەڵکی پرسیاری شەرعی لە کێ بکەن، واتە هەم کەسانی فەتوادەر دەبێ دیار بن

و بناسرێن، هەم خەڵکیش دەبێت بزانن چ کەسێک گەیشتووە بەو پلەیە بۆئەوەی پرسیاری لێ بکەن، لەهەمانکاتدا پێویستە دەزگایەکی فەرمی واش لە وڵاتدا هەبێت کە ڕێگە بگرێت لە پەشێوینانەوەی فەتوا، چونکە ئەگەر کەسانێکی زۆریش موفتیمان هەبێت، بەڵام لە چوارچێوەی دەزگایەکدا نەبن ئەوە دەبێتە هۆی کێشە نانەوە لەناو خەڵکدا، کە ئەمەش کاری دەسەڵاتی سیاسییە بە تەنسیق لەگەڵ دەزگای ئایینی وەزارەتی ئەوقاف و زانایانی ئایینی هەستن بە دامەزراندنی (دار الفتوى) بۆئەوەی خەڵکی دیندار و تەنانەت بێ دینەکانیش سەریان لێ نەشێوێت و سنوورێک بۆ ئەو فەوزایەی دروستبووە لەمەڕ فەتوای ڕۆژانەی خەڵکانی نامەسئول دابنرێت، وەک چۆن هەرکەسێک خاوەنی بڕوانامەی یاسا بوو بۆی هەیە ببێتە ئەندام لە سەندیکای پارێزەراندا، بەڵام مەرج نییە ببێتە قازی و مەرج نییە بە کەیفی خۆیشی لە هەموو دەعوایەکدا خۆی هەڵبقورتێنێت، بەڵکو بوونە قازی و بوونە پارێزەریش یاسا و ڕێسا و ئیجرائاتی تایبەتی هەیە و تەنانەت قەزاوەتیش پلەبەندی کراوە و لە قانووندا بواری پسپۆڕی و مەرجگەلێکی ناوەرۆکی و شێوەیی بۆ دیاریکراوە، بۆئەوەی فەوزا دروست نەبێت و پارێزەرانیش لەسەر بنەمای یاسا و ڕەچاوکردنی ئەخلاقیاتی پیشەکەیان موحامات دەکەن بە هەمان شێوەش مامۆستای ئایینی و خوێندەواری ئایینی پێویستیان بە یاسا و سنوورێکی دیاریکراو هەیە.

دووەم: نووسەر کێیە؟ ئەمیش بۆ خۆی ئیشکالێکی تری ناو بابەتەکەیە، مەبەست لە نووسەر چییە و چ کەسێک نووسەرە؟ ئایا هەرکەسێک بزانێت دوو دێڕ بنووسێت و دوو پرسیار و دوو گومان لە ڕۆژنامە و گۆڤارێکدا بورووژێنێت دەبێتە نووسەر؟ هەرکەسێک بڕوانامەیەکی وەرگرت و قاتێکی لەبەرکرد، یان حیزبێک لە ڕۆژنامەیەک دایناو کاری پێکرد دەبێتە نووسەر؟ بەم قیاسە بێت ئێمە نووسەرمان لە دووکاندار و جوتیار و کرێکار زیاترە، وڵاتی ئێمە وێڕای پشێوی فەتوا پشێوی نووسەریشی هەیە، زۆر کەسمان لێ بووە بە نووسەر و ڕۆژنامەوان بەبێ ئەوەی مەرجە پێویستەکانی تێدا بێت و بەبێ ئەوەی سنووری کارەکەی و ئەدەبیات و ئاکاری نووسین بزانێت و ڕێز و حورمەت بۆ قەڵەم و نووسین دابنێت، ئەمانیش لەگەڵ بوونی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان یەکێتی نووسەران نەیانتوانیوە کولتووری نووسین بەشێوەیەک بڵاوبکەنەوە کە نووسەری ڕاستەقینە لە نووسەری درۆینە جودا بکرێتەوە.

سێیەم: هەم نووسەران و هەم موفتیان لە فەزا و فانتازیای تایبەتیدا دەژین و پێیانوایە دەبێت ڕەوت بە کۆمەڵگە بدەن و لە ئەنجامدا لەسەر نفووز و دەسەڵاتی مەعنایی ناو خەڵک تێکدەگیرێن، لە هەردوو لاوە هێرش بۆ سەر ئەوی تر دەستپێدەکات، چونکە بوونی دوو فۆرم و دوو لۆجیکی جیاواز و دوو جیهانبینی جیاواز هەر ئەو حاڵەتی دژایەتییەی لێ دەکەوێتەوە کە ئێستا دەیبینین لە نێوان بەشێک لە موفتیان و هەندێک لە نووسەران، کە دەگاتە هەڕەشە و گوڕەشە و باری مەترسیداریش.

**پێویستە بە یاسا سنوورێکی ڕۆشن و بەرجەستە و مەلمووس بۆ هەموو کەسێك بەتایبەت نووسەران و وتاربێژان دیاری بکرێت بۆئەوەی هەموو کەسێك بەشێوەیەکی یاسایی و گونجاو مومارەسەی مافی نووسین و ڕادەربڕین بکات**

لە بنەڕەتدا هەڕەشە و توندوتیژی کاتێک دەستپێدەکات کە لۆجیکی قسە و گفتوگۆ کۆتایی پێهاتبێت، دیارە تەنها ئەوانەش لەسەر گفتوگۆی ئارام و ئامانجدار بەردەوام دەبن کە بۆ خۆیان کەسی حەقخواز و هەڵگری بارێکی مەعریفی سەنگین و ڕاستەقینە بن، هەڕەشەش لە شوێنێک پەرەدەستێنێت کە یاسا ڕۆڵ و کاریگەری ئەوتۆی لەسەر چاودێری ڕەوتی کۆمەڵگە نەمابێت، من هەرچەند حەق نادەم بە هەموو کەسێکی سەر میمبەر کە موفتی شەرعی بێت و پێموایە لە کەمیاندا مەرجەکانی فەتوا هاتووەتە دی، لەهەمانکاتدا حەق نادەم بە زۆر نووسەریش کە قسە لەسەر بابەت و پرسە ئایینە هەستیارەکان بکات، چونکە ئەوانە زۆریان ماوە بۆئەوەی تەنانەت لە دەقەکانی قورئان و سوننەت و تێکستە فیقهی و کەلامی و فیکرییەکانی ئیسلام تێبگەن، بۆیە لەڕاستیدا پێویستە سەرەتا سەرزەنشت و لۆمەی ئەو نووسەرانە بکرێت کە ئاوەها بێباکانە و دوور لە بابەتی بوون و بێ لایەنی فوو لە خۆری ڕۆشن و ڕۆشنگەری ئیسلام دەکەن و بەو خەیاڵەوە دەژین

کە پایەکانی بڕوا لە ویژدان و ژیری ئەم کۆمەڵگەیە سست بکەن و ئەم کارەشیان بەشێوەیەکی بێ پەردە و لەژێر باڵی فەزای کراوەی سەردەمدا بەناوی ئازادی ڕادەربڕین و بە پاساوی پێشخستنی وڵات ئەنجام دەدەن و بیانەوێت و نەیانەوێت هەست و نەستی زۆرینەی خەڵک بریندار دەکەن، دەبێت لە پاش ئەو جۆرە کارە چاوەڕوانی چ کاردانەوەیەک بین لە کەسانی دیندار، بەتایبەت لە مامۆستایانی ئایینی کوردستان، ئایا بەتەما بین ئافەرینیان بۆ بکەن و بە باشی ناویان ببەن؟ یان بە تەمای ئەوە بین بێدەنگ بن و داکۆکی لە پیرۆزییەکان و بەها و بایەخە ئایینییەکان نەکەن؟ واتە نووسەران خۆیانن بە خراپ حاڵی بوون لە مافی ئازادی و خراپ مومارەسەکردنی ماف و ئەرکی نووسین و ڕۆشنگەری، ئاگر لە ویژدانی خەڵکی بەردەدەن و دەبنە بەشێک لەو فەوزای توندوتیژیی و هەڕەشەیەی جاروبار ئاسۆی ئەم وڵات و نیشتیمانە دادەگرێت، بەڵام مەرجیش نییە هەموو فەتواکان ڕەوا بن و پەلەپەلی تێدا نەبێت و لە خراپ حاڵی بوون و گوزارشتی ناتەواوەوە سەرچاوەیان نەگرتبێت، وەک چۆن مەرج نییە هەموو نووسینەکانیش پەیامێکی جددی و ڕاستەقینەیان پێ بێت، یاخود لەسەر بنەمایەکی زانستی و کولتووری پتەو ڕوونرا بێت.

**بەم پێیە دەتوانین ئەم جۆرە هەڕەشانە ببەستین بە چەند هۆکارێکەوە:**

١ – لێکدابڕانی نێوان هەردوو تەوژمی ئیسلامی و عەلمانی بەشێوەیەک کە تا بێت گۆشەی نێوانیان زیاتر دەکرێتەوە و بەتەواویش نازانن لە چیدا کۆکن و لە چیدا ناکۆکن و لە ئەنجامدا وێنایەکی خراپیان لەسەر یەکتر بۆ دروست دەبێت و شەڕی دەسەڵاتیش لەسەر شەقامی فیکریی و ئایدیۆلۆژی ئەوەندەی تر زبر و توندیان دەکاتەوە.

٢ – دیاری نەبوونی سنوورەکانی ماف و لێپرسینەوەی نووسەران و وتاربێژان بەشێوەیەک نووسەر بەناوی مافی ئازادی ڕادەربڕینەوە ڕێگا بە خۆی دەدات تەنانەت یاساکانیش پێشێل بکات و کەس لە گوڵ کاڵتریشی پێ نەڵێت، لەهەمانکاتدا وتاربێژیش بەناوی بەرگری لە ئایینی خودا و پاراستنی پیرۆزییەکان هەڵوێستی توندوتیژ بەرانبەر ئەو جۆرە نووسەرانە دەنووێنێت، هەرچەندە یاسای سزادانی عێراقی لە مادەی (٣٧٢) باسی ئەو تاوانانەی کردووە کە هەستی ئایینی بریندار دەکەن و سزاشی بۆ داناون لە مادەکانی (٤٣٠ و ٤٣١ و ٤٣٢)، دەقی لەسەر تاوانی

هەڕەشە و تۆقاندن و سزاکانیشی داناوە، بەڵام هەتا ئێستا نەمانبینی نووسەرێک لەسەر بێڕێزی نواندن و سووکایەتی بە ئیسلام سزادرابێت، هەرچەندە دیومانە مەلا و خەتیبەکان لەسەر ڕوونکردنەوەی حوکمی شەرعی ئەزیەت دراون، بەڵام بەشێوەیەکی دوور لە یاسا و بەبێ بوونی دادگایەکی ئاشکرا.

٣ - گومان هەیە لەسەر ئەوە لە هەردوو لا کەسانێک هەبن پێویستیان بە وورووژاندنی ئەم جۆرە شتانە هەبێت بۆ جێبەجێکردنی ئەجێندایەکی سیاسی و بۆ تێکدانی باری کۆمەڵایەتی و ڕەوتی تەبایی و دۆستایەتی و یەکپارچەی ناو گەلی کوردستان، هەرچەندە مەرجیش نییە هەموو نووسەرێک و هەموو وتاربێژێک خراپ بێت یان کار بۆ ئەجێندایەک بکات، بەڵام بێگومان زۆرن ئەو هێز و لایەنانەی چاویان بە کوردستان و گەلی کورددا هەڵنایە و خەڵکێکیش بە نەزانی و بەبێ دیراسەت خزمەت بە نەخشە و سیناریۆکانیان دەکەن.

٤ - بێدەنگبوونی دەسەڵاتی سیاسی لە هەموو ئەو بێ حورمەتی و سووکایەتییەی ژمارەیەک بە ناو نووسەری یاخی و نامەسئوول دەرحەق بە پیرۆزییەکانی ئیسلامی دەکەن، بەشێوەیەک کە دینداران هیچ چارەیەکیان نەماوە جگە لە هاوارکردن و ناڵەناڵ و خۆ تووڕەکردن لەو ڕەوشە نەویستراوە فەرزکراوە سەپێندراوە، هەربۆیە وتاربێژان ئەو مافە بە خۆیان دەدەن کە پڕ بە دەم ناڕەزایی دەرببڕن و بەبێ هەڵوێستەکردن فەتوای توندوتیژیان لەسەر بدەن.

٥ - ڕەچاونەکردنی دەستوور و یاسا و ئەدەبیاتی گفتوگۆ و پێکەوەژیانی ئیجابییانە لە هەردوو لاوە ئەوەندەی تر برەوی بەم حاڵەتی هەڕەشە و گوڕەشە و بە یەکتر هەڵشاخانە داوە.

هیوادارم ئەو نووسەرانە پێش هەموو شتێک بە خۆیان و قسە و بۆچوونەکانیاندا بچنەوە و سەرەتا دوور لە ڕاگەیاندنی چەواشە و تەماعی پلەوپایە چەند ڕۆژێک فێری ئەدەبی نووسین و ئەدەبی ڕادەربڕین و مونازەرە بن ئەوسا نزیکی پرس و بابەتە ئایینییەکان ببنەوە، هەروەک هیوادارم زانا ئایینییەکانیش زۆر بەوردی نووسینی نووسەران و بەرهەمی کەسانی دیکە بخوێننەوە و هەموو قسەیەکی نەگونجاویش بە کوفر و بێ بڕوایی ناوزەد نەکەن هەتا نەچنە بنج و بناوانی ئەوە و بە تەواوی لە مەبەستی نووسەر و ئەنجامەکەی دڵنیا نەبن.

بێگومان نووسەری ڕاستەقینە پێویستی بە فەزا و دنیایەکی دوور لە ترس و

دڵەڕاوکێ و دوور لە هەڕەشە و تۆقاندن هەیە و بەبێ فەراهەمکردنی ئەو فەزایە نووسەری پەیامدار ناتوانێت بە جوانی و بە ڕوونی پەیامەکەی بگەیەنێت، بەڵام نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت ئێمە نووسینمان لەپێناوی بەژەوەندییە باڵاکانی تاک و کۆمەڵدا بەلاوە گرنگ و پیرۆزە و هەرگیز ڕازی نابین کەسێک ئەوەندە ئازاد و ڕەها بێت کە سنوورەکانی ماف و پیرۆزییەکانی خەڵک ببەزێنێت و بەناوی ڕەخنە و ڕۆشنگەری و هەر دروشمێکی دیکەوە هەست و نەستی ئایینیمان بریندار بکات، چونکە ئایین بۆ خۆی بەش و ڕەگەزێکی نەپچڕاوی شوناسی گەلەکەمانە. کەواتە وێڕای جەختکردن لەسەر ئازادی ڕادەربڕین و پەیام گەیاندن دەبێت جەخت لەسەر چوارچێوەی ڕێز لە بیر و بڕوا و پیرۆزییەکانیش بکەین.

پێویستە بە یاسا سنوورێکی ڕۆشن و بەرجەستە و مەلمووس بۆ هەموو کەسێک بەتایبەت نووسەران و وتاربێژان دیاری بکرێت بۆئەوەی هەموو کەسێک بەشێوەیەکی یاسایی و گونجاو سومارەسەی مافی نووسین و ڕادەربڕین بکات و هەموو کەسێک دڵنیابێت لە سەروەری و شکۆی خۆی و دڵی شاد بێت بە حورمەت و ڕێزلێگیرانی بیر و بڕواکەشی. یەکێتی زانایان و یەکێتی نووسەران و سەندیکای ڕۆژنامەنووسانیش پێویستە ڕۆڵی ئیجابی ببینن لە وریاکردنەوە و ڕەوتپێدانی ئەندامەکانیان و پێکەوە بە میکانیزمی ۆرکشۆپی هاوبەش و کاری هاوبەش کۆتایی بە خراپ حاڵی بوون و لێکدابڕانی نێوانیان بدەن و دەسەڵاتی سیاسی کوردیش پشتگیری لە هەموو مافێکی یاسایی و هەموو ڕەخنەیەکی بنیادنەری زانستی بکات، لەهەمانکاتدا پێویستمان بە بوونی چاودێرێکی زاتیش هەیە لە خودی خۆماندا بۆئەوەی لە نووسین و لە وتاردان و هەڵوێست وەرگرتندا ئاگاداری ماف و حورمەت و ڕێزی خەڵکی و کەسی بەرامبەر بین و هەمیشە خۆمان بە دوور بگرین لە شێوەی نووسین و قسەی شێتانە و هەڵچوونی نەزانانە و بزانین بۆچی دەنووسین و بۆچی دەدوێین؟



د.یاسین تەها

# جیاوازی فەتوا و
## پەیڕەوی ئاییندارى لە مێژووی ئیسلامیدا

**دەسپێک:**

ڕاجیایی فیقهی و جۆراوجۆریتی فەتوا و ئیجیتهادکردن؛ مێژوویەکی دێرینی هەیە لە ئیسلامدا و دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی خودی ئایینەکە خۆی. بەتێپەڕبوونی کاتیش ئەم ڕاجیاییە لە شێوازی ئایینزا و دیدگای ئایینی جیاجیادا فۆرمەلە بووە کە فرەییەکی فیقهی و عەقیدەیی لە چوارچێوەی تەنانەت یەک ئاڕاستەی ئایینیشدا لێکەوتووەتەوە. ئەم وتارە هەوڵدەدات گوزەرێک بە گرنگترین وێستگەکانی دابەشبوونی ئایینی بکات لە هەردوو بواری بیروباوەڕ (العقیدة) و پەرستش (العبادات) لە نێوان پەیڕەوانی ئاینزای گشتگیری سوننە.

### ئیجتیهادی لە سەرەتاکانی ئیسلامدا:

مێژووی ئیجتیهادکردن و واڵاکردنی دەرگای تێگەیشتن لە دەقەکان لە ئیسلامدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەر (د.خ)، لەم قۆناغە بنەڕەتییەدا کە هی دامەزراندنی بنەماکانی ئایینەکەیە، هەندێک لە هاوەڵان (الصحابة) بۆ هەڵهێنجانی حوکمی شەرعی؛ خۆیان ئیجتیهادیان کردووە، بەبێ ئەوەی هیچ ڕێگرییان لێ بکرێت، تەنانەت دەگێڕنەوە هەرکەس لە هاوەڵان پێچەوانەی ڕای زۆرینەی بکردایە لەهەر بوارێک کە دەقێکی ڕوونی لەسەر نەبووایە، ئەوە بە ئیجتیهاد دەیاندایە قەڵەم و تێگەیشتنیان بۆی هەبوو[١]، لەم میانەیەشدا چەند گێڕانەوەیەک هەن کە دەشێت دیارترینیان ئەمانەبن:

ـ دوو کەس لە هاوەڵان بە «تەیەموم» نوێژیان کرد، بەرلەوەی کاتی نوێژەکەش بەسەر بچێت ئاویان دەستکەوت، یەکێکیان دەستنوێژی شوشت و نوێژەکەی دووبارەکردەوە، بەڵام ئەوەی تر نەیکرد، دواتر پرسیاریان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد، ئەویش بەوەیانی وت کە نوێژی دووبارە نەکردەوە: «سونەتت پێکاوە»، بە دووەمیشی ڕاگەیاند دووجار پاداشتت هەیە، بەوپێیەی نوێژێکیان فەزرەکەیە و دووبارەکەش دەبێتە سوننەت (نفل)[٢].

ـ لە سەرچاوەکانی فەرموودەدا ڕووداوێکی بەناوبانگ هاتووە کە «عەمری کوڕی عاس» لە غەزای «ذات السلاسل»، بەیانییەک لەشی گرانبوو (الجنابة)، سەرباری هەبوونی ئاویش، بە تەیەموم نوێژیکرد بۆ خەڵکەکە، چونکە دەترسا لە نەخۆشکەوتن، دواتر ئەمەیان بۆ پێغەمبەر (د.خ) باسکرد، ئەویش پرسیاری لێکردبوو: بە لەشی گران بەرنوێژێت بۆ خەڵک کرد؟ ئەویش وتوویەتی: بەڵێ ئەو ئایەتەی قورئانم بیرهاتەوە (وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا)، پێغەمبەریش(د.خ) پێکەنیوە، هیچ ڕەخنەیەکیشی لە هەنگاوەکەی نەگرت و ئیجتیهادەکەی پەسەندکرد[٣].

سەرباری ئەم نموونانە کە هاوشێوەی تریان هەیە، هاوەڵان خۆیان بۆ تیۆریزەکردن و دامەزراندنی ڕێچکە و مەزهەبی تایبەت تەرخاننەکردووە و زیاتر خەریکی ژیانی کرداریی و بەشداری لەشکرکێشی و هەڵمەتە سەربازییەکان بوون[٤]، هەر لەبەر ئەمەش لە سەردەمی هاوەڵاندا ئایینزای فیقهی لەدایکنەبووە و پارێزگاریی لە چوارچێوە گشتییەکە کراوە، لەگەڵ هەبوونی دەرفەت بۆ

ئیجتیهادکردن لەسەر ئاستی تاک لەم بوارەشدا چەند هاوەڵێکی موجتەهیدی ناسراو لە بابەتەکانی شەرعزانی و تەفسیر و ڕاڤەی دەقەکان دەرکەوتوون لە چەشنی، «معاذ بن جبل»، «أبو موسى الأشعري»، «ابن عباس»، «ابن مسعود»، «ابن عمر» و ... هتد، هەروەها چوار خەلیفە ڕاشیدینەکەش دواتر بوونەتە سەرچاوە و موجتەهید لە جێبەجێکردنی شەریعەت و ئەحکامەکان لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێشینە دەوڵەمەندەی لە ئیسلامدا هەیانبووە. لەنێو هاوەڵە موجتەهیدەکاندا کەسێکی وەک «ابن عباس» لە پێنج مەسەلە و «ابن مسعود» لە پێنج مەسەلە ڕای تایبەتی تاکانەی خۆیان هەیە کە جیایە لە هی هەموو هاوەڵان و «زيد بن ثابت» لە مەسەلەیەک، ئەمەش بە ئاسایی و «ئیجتیهاد»ی تاکەکەسی لێیان وەرگیراوە[٥]، بەڵام لە پاش ئەوان، ڕاجیاییە فیقهیی و ئیجیتهادە جۆربەجۆرەکان لە شێوازی مەزهەبی فیقهیدا گەڵاڵەکران و ئەمانەش یان بە قوتابخانەی فیقهی یان بە ئایینزای سەربەخۆ ناسران[٦].

### سەرهەڵدانی ئایینزاکان:

لە قۆناغی پاش هاوەڵاندا ئیجتیهاد و ڕاجیایی فیقهی لە شێوازی ئایینزای سەربەخۆدا دەرکەوتن کە لە ئەدەبیاتی ئیسلامیدا پێیدەوترێت «المذهب». ئەم ئایینزایانەیش چوارچێوەیەک بوون بۆ کۆکردنەوەی ئەو ئەحکامانەی کە شەرعزان و زانایانی موجتەهید کە لە بەڵگەکانەوە گەڵاڵەیان دەکرد ئیتر چ شەرعزانی بن یان بابەتی بیروباوەڕ[٧]، لە عورفی باوی سەردەمە ئیسلامییەکانیشدا «مذهب» بە بیروبۆچوونی خاوەنەکانی گوتراوە ئیتر چ دڵنیابووبن لێی یان بە گومان و گریمانە پەسەندیان کردبێت[٨]. هەندێکی تر پێیانوایە مەزهەب قسەی موجتەهیدە چ بەدڵنیایی یان گومانکردن و هەڵهێنجان دەربیرِبیبێت بە بەڵگەوە، بەو مەرجەی تا مردن لەسەری بووبێت و لێی پەشیمان نەبووبێتەوە، بەڵام هەندێکی تر ئایینزا فراوانتر دەکەن بۆ قسە و ئاماژەی پێشەوایان یان هەڵهێنجانی شوێنکەوتەکانیان لە دەقەکانیان یان شیکارکردن و لێکدانەوەیان بەمەش چوارچێوەیەکی گەورەتر و هەمەچەشنتری پێدەدەن[٩]، لە مێژووی ئیسلامییشدا بەکردەیی مەزهەبەکان هەروابوون و تەنیا بە دامەزرێنەرانەوە پەیوەستنەبوون، بەڵکو بۆچوون و فەتوا و ڕاوبۆچوونی شوێنکەوتەکانیشیان تێکەڵە، نموونەی ئەمەش مەزهەبی شافیعییە کە بەناوبانگترین داڕشتنەوە و ڕێکخستنەوەی لەسەر دەستی هەردوو پێشەوای

نێوداری ئایینزاکە؛ «الرافعي» (م. ٦٢٤ک/١٢٢٥ز) و «النووي » (م. ٦٧٦ک/١٢٧٧) بووە[١٠]، ئەم دوو پایە گرنگەی مەزهەبەکەش لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا ژیاون کە دەکاتە دەوروبەری پێنج سەدە پاش پێشەوای دامەزرێنەر.

## ئایینزا فیقهی و عەقیدەییەکان:

بابەتەکانی عەقیدە لە ئیسلامدا زیاتر دەچنە خانەی مەسەلە بنەڕەتییەکان (الأصول)، ئەمەش زیاتر لە یەکتاپەرستی (التوحيد)، واتاکانی ناو و سیفەتەکانی خودا (الأسماء والصفات) و بنەماکانی ئایین دەکۆڵنەوە، لای کەسێکی وەک پێشەوا ئەبو حەنیفەش، بە «الفقه الأكبر» ناوبراوە، ئەمەش هەر هێمایە بۆ بنەڕەتی بوونی بیروباوەڕ بەراورد بە پەرستش. هەرچی بابەتەکانی شەرعزانییش هەیە بریتین لە چۆنیەتی بەجێهێنانی پەرستشەکان (العبادات) و جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی شەریعەت، ئەمانەش لقن لە بنەڕەتە گەورەکان و پێیان دەگوترێت «الفروع»[١١].

لەناو شوێنکەوتووانی مەزهەبە سوننەکان کە بە پلەی یەکەم شوێنپێهەڵگری نەقڵن و عەقڵ وەک میکانیزمێک بۆ پاڵپشتیکردن لە نەقڵ بەکاردەهێنن، لەسەر بابەتەکانی عەقیدە تاڕادەیەکی بۆچوونەکانیان نزیکن، بەڵام لە جێبەجێکردنی ئەحکامی شەریعەت و هەندێکی تری عەقیدە ڕاجیایی زۆریان هەیە و لەسەر وردەکارییەکان جیاوازن[٢١]، هەر بەم هۆیەشەوە لە سەدەی ٤ک/١٠ز، دەورووبەری ٢٨ مەزهەب و ڕێچکە لە بوارەکانی عەقیدە و شەرعزانی و فەرموودەدا لەناو بەرەی مسوڵمانە سوننەکاندا دەرکەوتوون[١٣]، هەریەک لەوانەش ئاڕاستە و بەڵگە و دیدگای تایبەت بەخۆیان هەیە بۆ ئایینداریی و لەوی تریان سەربەخۆن.

لە قۆناغەکانی دواتردا و لە پاش سەردەمی «تابعین»، ئاڕاستە شەرعزانییەکانی نێو بەرەی سووننە بەسەر دەوروبەری ١٠ مەزهەبی بڵاوی ناسراودا دابەشبوون، شەش لەوانەش دواتر پووکاونەتەوە و جێگەیان بۆ ئەوانەی پێش خۆیان چۆڵکردووە، سەرجەمیشیان بە گوێرەی ڕیزبەندی مێژوویی بریتین لە[١٤]مەزهەبەکانی: «أبو حنيفة» (م. ١٥٠ک/٧٦٧ز)، «الأوزاعي» (م. ١٥٧ک/٧٧٤ز)، «سفيان الثوري» (م. ١٦١ک/٧٧٨ز)، «ليث بن سعد» (م. ١٧٥ک/٧٩٢ز)، «المالكي» (م. ١٧٩ک/ ٧٩٥ز)، «الشافعي» (م. ٢٠٤ک/٨٢٠ز)، «اسحاق بن راهوية»، (م. ٢٣٨ک/٨٥٢ز)، «ابن حنبل» (م. ٢٤١ک/ ٨٥٥ز)، «داود الظاهري» (م. ٢٧٢ک/٨٨٦ز)، «الطبري» (م. ٣١٠ک/٩٢٣ز).

**چوار ئاییزاکەی سوننە:**

زۆریی و فرەیی ئاییزا فیقهییەکانی سوننە زۆر درێژەی نەکێشاوە لە مێژوودا و لە کۆتاییەکانی سەدەی چوارەمی کۆچییەوە، ژمارەیەکی زۆریان لە بەرژەوەندی چواری سەرەکی کە بە «چوار ئاییزاکە» دەناسرێن (المذاهب الأربعة) پووکاونەتەوە[١٥]. ئەم چوار ئاییزایەش بریتین لە: حەنەفی، مالیکی، شافیعی و حەنبەلی. پێشیان دەگوترێت «مذاهب الأمصار»، بەو واتایەی لە شارە ئیسلامییەکان بڵاون و هیچ شارێک نییە لەو مەزهەبانەی تێدا نەبێت، ئەگەر هەمووشیانی تێدا نەبن[١٦].

> **مەزهەب قسەی موجتەهیدە چ بەدڵنیایی یان گومانکردن و هەڵهێنجان دەربرِبێت بە بەڵگەوە، بەو مەرجەی تا مردن لەسەری بوویێت و لێی پەشیمان نەبوویێتەوە**

هۆکاری سەرەکی پووکانەوەی ئەم کۆمەڵە مەزهەبە بەرامبەر بە هەژموونی چوارە سەرەکییەکە بە پلەی یەکەم مەرگی زاناکانیان و بەردەوام نەبوونی شوێنکەوتەکانیانە لە پەیرِەوکردنیان[١٧]. تان و پۆی هەر چوار مەزهەبە سەرەکییە سوننەکەش کە بوونەتە بنەمای خواپەرستی، دەچێتەوە سەر دوو قوتابخانەی سەرەکی لە شەرعزانی کە قوتابخانەکانی بیرورِا (الرأي) و قوتابخانەی فەرموودە و دەقن [١٨]، قوتابخانەی یەکەمیان (الرأي) بە پلەی یەکەم لە عێراق و دووەمیشیان (الحديث) لە حیجاز باو و بڵاو بووە[١٩]، هەردوو قوتابخانەکەش لە وردەکاریدا جیاوازی زۆریان هەیە[٢٠]، بەڵام سەرجەمیان دەچنە ژێر ناوی «أهل السنة» کە زیاتر بەرامبەر پەیرِەوانی شیعەگەریی و گرۆکانی تر بەکاردێت [٢١]. ئەم دوو قوتابخانە بنەرِەتییەش لە هەندێک شتدا جیاوازن لەوانەش بابەتەکانی پەیوەست بە سیفەتەکانی خودا (الأسماء والصفات) و مەسەلەی حەقیقەت و مەزاج لە قورئان

و هەندێک وردەکاریی لە بابەتی قەدەر، بەڵام سەرباری ئەمەش لەسەر کۆمەڵێک بنەما هاودەنگ و هاوڕان لە نموونەی ئەوانەش: پشتبەستن بە دەقەکانی قورئان و سوننەت وەک دوو سەرچاوەی سەرەکی و «معصوم»، پێشخستنی نەقڵ بەسەر عەقڵدا، پەسەندکردنی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی (پەسڵان)، هەڵوێست لە هاوەڵان و پەسەندکردن و ستایشکردنیان، باوەڕهێنان بە سزای ناوگۆڕ، بابەتەکانی ڕۆژی دوایی لە چەشنی «المیزان، الحوض، الصراط، الشفاعة»[٢٢].

## پوختە:

میژووی کردنەوەی دەرگای ئیجتیهاد و بەگەڕخستنی توانا بۆ هەڵهێنجانی حوکم لە دەقەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ژیانی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ). لەدوای ئەوەش ڕاجیایی فیقهی و عەقیدەیی لە شێوازی کۆمەڵێکی زۆر قوتابخانە و ئایینزادا فۆرمەلە بووە، بەڵام پەرەسەندنە مێژووییەکان کورتیان کردوونەتەوە بۆ دوو قۆتابخانەی سەرەکی کە قوتابخانەی ڕا و قوتابخانەی دەقن، لە سێبەری ئەم دوو ڕەوتەشدا چوار ئایینزای فیقهی ناسراو بەسەر هەموو شار و نشینگە ئیسلامییەکاندا باڵادەستبوون و سەرجەم ئەم ئاڕاستانەش خاڵی بەیەکگەیشتن و خاڵی جیاوازیشیان هەیە.

## پەراوێزەکان:

(١) ابن تيمية، جامع الفصول، تحقيق عبدالله آل غيهب (السعودية: دار أطلس، ٢٠٢٠)، ص ٢٥٠.

(٢) ابن القيم، إعلام الموقعين عن رب العالمين تحقيق محمد عبدالسلام(بيروت: دار الكتب العلمية، ١٩٩١)، ج١، ص ١٥٦.

(٣) محمد الصوياني، الصَّحيحُ من أحاديث السّيرة النبوية، (مدار الوطن للنشر، ٢٠١١)، ص ٤٤١.

(٤) ابن الصلاح، فتاوى ابن الصلاح، تحقيق، موفق عبد الله، (بيروت: مكتبة العلوم، ١٤٠٧ هـ)، ج١، ص ٨٨.

(٥) ابن تيمية، جامع الفصول، ص ٢٥١.

(٦) محمد أبو زهرة، تاريخ المذاهب الإسلامية في السياسة والعقائد وتاريخ المذاهب الفقهية (القاهرة: دار الفكر العربي، د. ت) ، ص ٢٨٨.

(٧) أحمد محمد نصير الدين النقيب، المذهب الحنفي مراحله وطبقاته، ضوابطه ومصطلحاته، خصائصه ومؤلفاته (الرياض: مكتبة الرشيد، ٢٠٠١م)، ج١، ص ٣٥؛ خالد بن مساعد الرويتع، التمذهب، ص ٦٧.

(٨) المرداوي، الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف (بيروت: دار إحياء التراث العربي، ط٢، د.ت)، ج٢، ص ٢٤١.

(٩)خالد بن مساعد الرويتع، التمذهب دراسة نظرية نقدية (الرياض: دار التدمرية، ٢٠١٣)، ص ٦٧ _ ٦٨ .

(١٠) الجويني، نهاية المطلب في دراية المذهب، تحقيق، عبد العظيم محمود الديب. جدة: دار المنهاج، ٢٠٠٧، ١٥٤.

(١١) شمس الدين الحنبلي، لوامع الأنوار البهية وسواطع الأسرار الأثرية لشرح الدرة المضية في عقد الفرقة المرضية (دمشق، مؤسسة الخافقين، ١٩٨٢)، ج١، ص ٤_٥.

(١٢) أحمد تيمور باشا، نظرة تاريخية في حدوث المذاهب الفقهية الأربعة، (بيروت: دار القادري،١٩٩٠م)، ص ٢٤.

(١٣) المقدسي، أحسن التقاسيم. القاهرة: مكتبة مدبولي، ١٩٩١م، ص ٣٧.

(١٤) السيوطي، الحاوي للفتاوي (بيروت: دار الفكر، ٢٠٠٤ م)، ج٢، ص ١٨٩.

(١٥) _ آدم متز، الحضارة الإسلامية في القرن الرابع الهجري، ترجمة محمد عبدالهادي أبو ريدة، (بيروت: د.ن. د.ت، ط٥)، ج١، ص ٣٨٨_ ص ٣٩٥.

(١٦) أحمد باشا، نظرة تاريخية، ص ٣١.

(١٧) السيوطي، الحاوي للفتاوي. بيروت: دار الفكر، ٢٠٠٤ م، ج٢، ص ١٨٩.

(١٨) الشهرستاني، الملل والنحل، تحقيق أحمد فهمي محمد. بيروت: دار الكتب العلمية، ١٩٩٢م ، ج٢، ص ١١.

(١٩) ابن خلدون، المقدمة، تحقيق، عبد الله الدرويش. دمشق: دار يعرب، ٢٠٠٤م، ج٢، ص ١٨٥.

(٢٠) الشهرستاني، الملل والنحل، ج٢، ص ١٢.

(٢١) ابن تيمية، مجموع الفتاوى، تحقيق، عبد الرحمن بن محمد بن قاسم (المدينة: مجمع الملك فهد، ١٩٩٥)، ج٣، ص ٢٧٨_٢٩٢.

(٢٢) عبدالقاهر البغدادي، الفرق بين الفرق، تحقيق مجدي السيد، القاهرة: المكتبة التوفيقية، د.ت، ص ص ٢٥٣ _٢٦٥؛ ابن تيمية، الوصية الكبرى، تحقيق وتعليق، محمد عبدالله النمر وعثمان جمعة ضميرية، مكتبة الصديق، الطائف، ١٩٨٧م، ص ص ٤٧ _٥٢.



ئازاد عەلی ئیسماعیل

# سایکۆلۆجیای فەتوا:

## کاریگەری دەروونی فەتوا لەسەر تاک و کۆمەڵگە

**پوختە:**

پێشەکی: لە کۆمەڵگەی موسڵمانان فەتوا دیاردەیەکی بەربڵاوە. هەندێ بابەتی تازە و هاوچەرخ هاتوونەتە ئاراوە و موسڵمانان زانیاری تەواویان لەسەریاندا نییە، لەڕووی شەرعەوە. تاکێکی موسڵمان پەنا بۆ فەتوا دەبات کاتێک حوکمی شەرعی، لە ڕووداوێکدا، لا ڕوون نییە. ئامانجی ئەم تۆژینەوەیە خستنەڕووی کاریگەری فەتوایە لەسەر دەروونی تاک و کۆمەڵگەی موسڵمانان. ئەم تۆژینەوەیە باس لە فەتوا و جۆرەکانی دەکات و تیشک دەخاتە سەر سیفەتەکانی موفتی و فەتواخواز. هەروەها هەندێ لە ڕەهەندە دەروونییەکانی فەتوا، موفتی و فەتواخواز باس دەکات. لە کۆتا بەشدا باس لە کاریگەری فەتوا لەسەر تاک و کۆمەڵگە دەکات.

**پێشەکی:**

لە کۆمەڵگەی موسڵمانان، هەر لە کۆنەوە هەتا ئێستا، بە بەردەوامی کۆمەڵێک بابەت و ڕووداوی نوێ هاتوونەتە ئاراوە، بە حوکمی گۆڕانکاری بارودۆخ و کۆمەڵگە. موسڵمانانیش بۆئەوەی وەڵامێکی دروستیان بۆ ئەو گۆڕانانە هەبێت، دەبێ هەڵوێستی شەرع لە بەرانبەر ئەو بابەت و ڕووداوە تازانە بزانن. دیارە ئەو ڕووداو و بابەتانە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگەی موسڵمانانەوە هەیە.

ئەو موسڵمانانەی شارەزای وردەکاری شەرعن، بە پشتنبەستن بە خۆیان دەتوانن وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە سەبارەت بە حەڵاڵی یان حەرامی کارێکی تازە، بەڵام زۆرینەی خەڵک ئەم جۆرە شارەزاییە وردەیان نییە، بۆیە پەنا دەبەنە بەر پرسیارکردن لە کەسانی شارەزا بەپێی بنەمای (فاسألوا أهل الذكر إن كنتم لا تعلمون).

فەتواش یەکێک بووە لەو ڕێگایانەی کە خەڵک پرسیاریان لە کەسانی شارەزا کردووە سەبارەت بە حوکمی شەرع لە هەمبەر بابەتێک کە ڕووبەڕوویان بووەتەوە. هەر لەو کاتەی کە پێغەمبەر (د.خ) لە ژیان بوو، هەندێ لە هاوەڵان داوای فەتوایان لێ کردووە وەک لەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی پێ دەکات: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَنْ تَضِلُّوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) (النساء:١٧٦). یان (وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُواْ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا) (النساء: ١٢٧).

لەم دوو ئایەتە ئاماژە بە جۆرێک لە فەتوا دەکات، کە زانایان ناویان ناوە الفتاوى التشريعية، بەڵام چەند جۆرێکی تری فەتواش هەن کە دێینە سەر باسیان. لە دوای پێغەمبەر(د.خ) هاوەڵان ئەرکی فەتوادانیان لە سەرشانیان داناوە و پێی هەڵستاون. هەندێک لە توژەران پێیانوایە کە ئەبوبەکری سدیق(ڕەزای خوای لێبێت) یەکەم موفتی بوو لە دوای پێغەمبەر کە فەتوای دابێت.

لە هەمان کاتدا سیفەتەکانی موفتی ومەرجەکانی گرنگییەکی زۆری پێدراوە لەلایەن زانایانی موسڵمان لە کۆن و ئێستادا، بۆئەوەی ئەو کەسەی کە شایەنی فەتوا نییە، فەتوا نەدات و خەڵک تووشی هەڵە نەکەن. لەهەمانکاتیشدا قسەیان لەسەر سیفەت و ئادابی کەسی فەتواخواز کردووە، وێڕای شیکردنەوەی فەتواکان و زۆرێک لەو بابەتانەی کە پەیوەندییان پێیەوە هەیە، وەک نووسینەوەی فەتوا و گۆڕینی فەتوا و چەندەها بابەتی تر.

**فەتوا چییە؟ پێناسەی فەتوا:**

فەتوا بە چەند شێوازێک پێناسە کراوە و بە حوکمی ئەوەی ئەم تۆژینەوەیە گرنگی بە کاریگەری دەروونی فەتوا دەدات، بۆیە ناچینە ناو جیاوازی نێوان ئەو پێناسانەی کە کراون بۆ فەتوا لە کۆنەوە تا ئێستا، بەڵکو تەنها ئاماژە بە یەک پێناسە دەکەین و لەم تۆژینەوەیەدا پشتی پێ دەبەستین.

**دار الافتاء المصرية (٢٠١١) بەم شێوەیە پێناسەی فەتوا دەکات:**

فەتوا ڕوونکردنەوەی حوکمێکی شەرعییە، بەپشتبەستن بە بەڵگە، بۆ کەسێک کە پرسیاری دەربارە دەکات کاتێک ڕووبەڕووی بارودۆخێک یان ڕووداوێک دەبێتەوە یان کاتێک دڵنیا نییە لە یەکێک لە ئەحکامەکانی شەرع. هەروەها گرنگە ئەو کەسەی کە فەتوا دەدات، یان موفتی، فەتواکەی بە زمانێکی سادە و ڕوون بێت و چەند مانایەک هەڵنەگرێت، بەڵکو یەک مانا. هەروەک گرنگە کە موفتی ئەوە بۆ فەتواخواز ڕوون بکاتەوە کە ئەمە فەتوایە ئیجتهادی ئەوە و نەیخاتە پاڵ خودا.

هەروەها دار الافتاء المصرية (٢٠١١) فەتوا بۆ دوو جۆر دابەش دەکات: فەتوای گشتی و فەتوای تایبەتی. فەتوای گشتی، وەک لە ناوەکەیەوە دیارە، گشت موسڵمانان یان کۆمەڵگە بەگشتی دەگرێتەوە، ئەوەش هەندێکجار ناوی نراوە (النوازل العامة)، واتە ئەو ڕووداوانەی کە بەسەر ژمارەیەکی زۆردا هاتووە. فەتوای تایبەتی، سەبارەت بە بابەتێکی تایبەتی دیاریکراو، واتە پەیوەندی بە خودی ئەو کەسەوە هەیە کە داوای فەتوا دەکات و بەو ڕووداوەی کە پرسیارەکەی دەربارە دەکرێت. فەتوای تایبەتی لەوانەیە بگۆڕێت بە گۆڕانی ئەو لایەنەی کە فەتواکە دەردەکات.

هەندێکی تر لە تۆژەران (تليمة، ٢٠٢٣) فەتوا بۆ سێ جۆر دابەش دەکەن: الفتاوى التشريعية، الفتاوى الفقهية والفتاوى الجزئية. مەبەست لە جۆری یەکەم ئەو حوکمە شەرعیانەیە کە لە قورئان و فەرموودەدا هاتوون، سەبارەت بە بارودۆخی

ئەو کات، بەڵام مەبەست لە (الفتاوی الفقهیة) ئەو فەتوایانەیە کە شەرعزانێک (یان فقیە) باسیان دەکات بێ ئەوەی کەس پرسیاری لێ کردبن، بەڵکو گەیشتووەتە ئەم فەتوایە لە ئەنجامی هەڵهێنجانێک یان گریمانەیەک بۆ بابەتێکی دیاریکراو. جۆری سێیەم، واتە (الفتاوی الجزئیة)، واتە بەشە فەتوا، یان فەتوای تایبەت، بریتییە لە وەڵامێک بۆ پرسیارێک سەبارەت بە ڕووداوێکی دیاریکراو. ئەم جۆرەی سێیەم لە فەتوا، بۆ دوو جۆر دابەش دەکرێت: فەتوای تایبەتی، کە تایبەتە بە کەسێک و فەتوای گشتی کە پەیوەندی بە ژمارەیەکی زۆر خەڵکەوە هەیە.

زانایان هەر لە کۆنەوە درکیان بە گرنگی فەتوا کردووە، هەربۆیە چەندەها کتێبی تایبەتیان لەسەر ئەم بابەتە نووسیوە. بۆ نمونە النووي (١٩٨٨) ئاماژە بەوە دەکات کە لەژێر ناونیشانی: أدب الفتوی والمفتي والمستفتي، سێ لە زانا بەناوبانگەکان کتێبیان نووسیوە کە بریتین لە: أبي القاسم الصیرمي، أبي بکر الخطیب البغدادي، وابي عمرو ابن صلاح (الشهرزوري). شایەنی باسە کە النووی خۆشی لەژێر ئەم ناونیشانە کتێبێکی نووسیوە و کتێبەکانی پێش خۆی کورت کردووەتەوە.

**فەتواخواز:**

لە ڕووی دەروونییەوە، ئاماژە بە دوو لایەن دەدەین کە پەیوەندی بە فەتواخوازەوە هەیە: یەکەم: کەسایەتی فەتواخواز، دووەم: پاڵنەرەکانی. لە خوارەوە بە کورتی باسی ئەم دوو ڕەهەندە دەکەین.

**کەسایەتی فەتواخواز:**

لە دەروونزانیدا کەسایەتی بە چەند شێوازێک پێناسە کراوە. لێرەدا، بێ چوونەناو وردەکاری هۆکارەکانی جیاوازی پێناسەکان، یەک پێناسە هەڵدەبژێرین و پێمانوایە کە پێناسەیەکی تاڕادەیەک گشتگیرە. پێناسەی لارسن وبەس (Larsen & Buss, ٢٠٠٨: ٤) یەکێکە لە پێناسە باشەکان کە پێیانوایە کەسایەتی بریتییە لە (کۆمەڵێک لە سیما و میکانیزمی دەروونی ڕێکخراو لەناو مرۆڤدا و بەشێوەیەکی ڕێژەیی جێگیرە و کاریگەری لەسەر چۆنیەتی کارتێکردنمان و خۆگونجاندنمان لەگەڵ ژینگەی ناخ و ژینگەی ماددی و ژینگەی کۆمەڵایەتیدا هەیە).

ئەو کەسەی کە بەدوای فەتوا دەگەڕێت، بابەتی ئایینی زۆر بەهەند وەردەگرێت و لای گرنگە کە ڕەفتارێک نەنوێنێت ئەگەر بەتەواوی لێی دڵنیا نەبێت کە کارێکی دروستە، لەڕووی شەرعەوە. بە حوکمی ئەوەی پیاو کەمتر پرسیار دەکەن، ئەو

کەسەی پرسیار لە حوکمی شەرعی دەکات، هەست ناکات کە ئەم پرسیارکردنە ئاماژە بۆ لایەنێکی لاوازی دەکات. هەندێکجار لەوانەیە کەسەکە تەنها بۆ مەبەستی زانین و زانیاری داوای فەتوا بکات، لەم حاڵەتەشدا دەزانین کە ئەم جۆرە کەسایەتییە حەزێکی زۆری بۆ زانین هەیە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە ئایینەوە هەبێت. کەواتە بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین، ئەو کەسەی کە داوای فەتوا دەکات کەسایەتییەکی ئایینداره و زۆر بەجیدییەوە ئایینەکەی وەرگرتووە و بەردەوام هەوڵ دەدات کە دڵنیا بێت ڕەفتاری ڕۆژانەی لەگەڵ شەرعدا گونجاوە. کەواتە لێرەدا ئەم جۆرە کەسایەتییە دەیەوێت کە ڕەفتاری هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ بیروباوەڕی ئایینیدا. ئەوەش نزیکە لە دوو لە پێنج فاکتەرە بەناوبانگەکانی کەسایەتی کە بە زمانی ئینگلیزی پێ دەگوترێ: Conscientiousness و Agreeableness.

خاوەنی سیمای کەسایەتی Conscientiousness، کە هەندێکجار وشەی ئەرکناسی لە بەرانبەری بەکاردێت، کاروباری ژیانی بە جددی وەردەگرێت و ڕێکوپێکە و لە ئیشوکارەکانی زۆر بە چاکی ڕادەپەڕێنێت. ئەو کەسەی کە بەدوای فەتوا دەگەڕێت کەسێکە کە لە ژیانیدا جددییە و نایەوێت کارێک بکات نادروست بێت. هەروەها خاوەنی سیمای کەسایەتی Agreeableness، کە وشەی تەباسازی لە بەرانبەریدا بەکاردێت، لە هەوڵی ئەوەدایە کە ئەوانی تر لێی ڕازی بن. لێرەدا مەبەستەکە ئەوەیە کە خودا لێی ڕازی بێت بەوەی کە هەر کارێک دەکات هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ ئاییندا. دیارە ئەم بۆچوونە تەنها گریمانەیە و پێویستی بە توێژینەوەی مەیدانی هەیە بۆ سەلماندنی یان ڕەتکردنەوەی.

**پاڵنەری فەتواخواز:**

مەبەست لە پاڵنەر بارێکی ناوەکییە کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆئەوەی ڕەفتارێکی تایبەتی بکات بەمەبەستی نەهێشتنی ئەو بارە ناوەکییە (ئازاد علی و سەرهەنگ ئیبراهیم، ٢٠١٩:١٣٢). گەڕان بە دوای فەتواش، یان فەتواخوازی بریتیە لە ڕەفتار، بەو مانایەی کە کارێکە مرۆڤ بە مەبەستەوە دەیکات. وەکو هەر ڕەفتارێکی تری مرۆڤ، لە پشت ڕەفتاری فەتواخوازی پاڵنەرێک یان زیاتر لە پاڵنەرێک هەیە.

پاڵنەرەکانیش بە چەند شێوەیەک دابەش دەکرێن کە لێرە بواری ئەوە نییە بە درێژی باسیان بکەین، بەڵکو بەگشتی دابەشی دوو جۆر دەکرێن:

جۆری یەکەم: پاڵنەرە فسیۆلۆجییەکان: کە زگماکن و پەیوەندییان بە سرووشتی جەستەی مرۆڤەوە هەیە و مەبەست لێیان ئەوەیە کە مرۆڤ بە زیندوویی بمێنێتەوە وەک برسێتی و خەوتن.

جۆری دووەم: پاڵنەرە دەروونی/کۆمەڵایەتییەکان: ئەو جۆرە پاڵنەرانە هەڵقوڵاوی دەروونی مرۆڤن وەک تاکێک لەناو کۆمەڵگەدا. بۆ نموونە پاڵنەری کۆبوونەوە و لاسایی کردنەوە... هتد.

پاڵنەری زانین: دەشێت پاڵنەری فەتواخواز بۆ دڵنیابوون بێت لە کارێک یان لە شتێک کە ئایا لەڕووی شەرعەوە دروستە یاخود نا؟ دڵنیانەبوون لە حەڵاڵی یان حەرامی کارێک، بۆ نموونە، بارودۆخێکی دەروونی دروست دەکات. کەسەکە داوای فەتوا دەکات بۆ دڵنیابوون و نەهێشتنی ئەو بارودۆخە دەروونییە (نیگەرانی).

پاڵنەری پاساوهێنانەوە: هەندێکجار دەشێت پاڵنەری فەتواخواز بۆ ئەوە بێت پاساوێک بدۆزێتەوە، کە لەڕووی شەرعییەوە دروست بێت، بۆئەوەی بە کارێک هەڵبستێت کە نیازیەتی. لێرەدا مەبەست زانین نییە، بەڵکو دۆزینەوەی پاساوە. خاوەنی ئەم جۆرە پاڵنەرە، ئەگەر فەتوایەک بە دڵی نەبوو، ئەگەری زۆرە کە بچێتە لای موفتیەکی تر و داوای فەتوا لەسەر هەمان بابەت دەکات.

پاڵنەری هەست کردن بە تاوان: دەکرێت گەڕان بەدوای فەتوا پاڵنەرە سەرەکییەکەی ئەوە بێت کە کەسەکە کارێکی کردووە و پەشیمانە و هەوڵدەدات بە دوای فەتوایەک بگەڕێت بۆئەوەی هەستکردنی بە تاوان کەمبکاتەوە یان نەیهێڵێت.

هەرچەندە پاڵنەر حاڵەتێکی ناوەوەیە و شاراوەیە، بەڵام گرنگە موفتی هەوڵبدات بزانێت پاڵنەری کەسی فەتواخواز چییە؟ دەکرێت ڕاستەوخۆ پرسیاری لێ بکات یان ئەگەر وەڵامێکی ڕوونی دەستنەکەوت، خۆی بگاتە ئەو ئاستەی کە بزانێ پاڵنەرەکە چییە.

سەبارەت بە ڕەفتاری فەتواخواز لەگەڵ موفتی، النووي (١٩٨٨: ٨٣-٨٥) دەنووسێت: پێویستە فەتواخواز لەگەڵ موفتی بە ئەدەبەوە ڕەفتار بکات و وەڵامەکانی بەهەند وەربگرێت و پرسیاری لێ نەکات: چ دەزانیت؟ یان لەسەر چ مەزهەبێکیت؟ یان پێی بڵێت فڵان کەس ئەم فەتوایەی بۆ داوم.. یان پێی بڵێت: بەڵگەت چییە؟

**موفتی:**

شەهرەزوری (العمري، ١٤٤٣: ١٤٥) ئەو کەسانەی کە فەتوا دەردەکەن (موفتی) بۆ دوو چین دابەش دەکات: موفتی سەربەخۆ، واتە پابەند نییە بە هیچ مەزهەبێک لە کاتی فەتوادان. جۆری دووەم: موفتی سەر بە مەزهەب یان پابەند بە مەزهەبێکی دیاریکراو، کە لە چوارچێوەیەوە فەتوا دەدات.

عمارة (٢٠٢٣) ئاماژە بە بۆچوونی ئیبن ئەلقەیم دەکات سەبارەت بە کاریگەری سۆز و ئینفیعالات لەسەر کەسایەتی موفتی و دەنووسێت (لاپەڕە٦٥): مرۆڤ تەنها لە حاڵەتی بوونی مگێز (مزاج)ێکی هاوسەنگ، دەتوانێت بە دروستی بیر بکاتەوە.. بۆیە لە فەرموودەدا هاتووە کە قازی نابێت لە کاتی تووڕەییدا حوکم بدات.

عمارة (٢٠٢٣: ٩٠-٩١) پێیوایە کە کەسایەتی موفتی ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە پرۆسەی فەتوادان. دەبێ کەسایەتی موفتی نەکەوێتە ژێر هەژموونی هەڕەشە و ترس لەلایەک و پارەوپول و پلەوپایە لەلایەکی ترەوە. دیارە هەرچەندە کەسی موفتی سەر بە دامودەزگایەکی حکومی یان سیاسی بێت، ئەگەری زیاترە کە بکەوێتە ژێر هەژموونی دەرەکی و ئەمەش کاریگەری لەسەر فەتواکەی دەبێت.

هەر بۆئەوەی موفتی فشاری دەروونی نەکەوێتە سەر، هەندێ لە زانایان لەو بڕوایەدان کە نابێت موفتی دیاری وەربگرێت، ئەگەر بەشێوەیەک لە شێوەکان پەیوەندی بە فەتواکە، یان ئەو کەسەی کە داوای فەتوا کردووە، هەبێت، بەڵکو هانی موفتی دەدەن کە خۆی بپارێزێت لەو فشارانەی کە لە ئەنجامی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەسەری دروست دەبن. حەزی بەناوبانگی و شۆرەت، لەوانەیە هۆکارێک بێت کە کاریگەری لەسەر فەتواکەی هەبێت.

پێویستە موفتی ڕەچاوی لایەنی دەروونی ئەو کەسە بکات کە پرسیارێک دەکات یان داوای فەتوایەک دەکات. هەندێکجار کەسێک پرسیار دەکات پێش ئەوەی کارێک بکات، لەسەر بنەمای فەتواکە کارەکە دەکات یان ناکات، بەڵام کاتێک کەسەکە کارێکی کردووە، لە ڕابردوودا و لە ئێستادا پرسیار دەربارەی دەکا،ت ئەوە حاڵەتێکی ترە. بۆ نموونە دەگێڕنەوە کە پیاوێک هاتە لای ئیبن عەباس و پرسیاری کرد، ئایا ئەوەی کەسێک بکوژێت دەکرێ تەوبە بکات؟ ئەوەیش لە وەڵامدا گوتی نەخێر.. ئینجا دوای ئەوەی پیاوەکە دەڕوات، لە ئیبن عەباس دەپرسن: پێشتر ئەم جۆرە فەتوایەت نەدەدا و فەتوای تۆ وابوو کە کەسی بکوژ دەشێ تۆبە بکات و لێی

قبوڵ دەکرێت، بۆچی ئیمڕۆ بەشێوەیەکی جیاواز فەتواتدا؟ ئیبن عەباس گووتی: وای بۆدەچم کە ئەو پیاوە زۆر توورە بووبێت و نیازی کوشتنی موسڵمانێکی هەبێت، بۆیە ئەم فەتوایەمدا بۆ ئەوەی ئەم کارە (واتە کوشتنە) نەکات.

قال ابو بكر ابن ابي شيبة ٢٧٧٥٣ قال حدثنا يزيد بن هارون قال أخبرنا أبو مالك الأشجعي عن سعد بن عبيدة قال:(( جاء رجل إلى بن عباس فقال لمن قتل مؤمنا توبة قال لا إلا النار فلما ذهب قال له جلساؤه ما هكذا كنت تفتينا كنت تفتينا أن لمن قتل مؤمنا توبة مقبولة فما بال اليوم قال إني أحسبه رجل مغضب يريد أن يقتل مؤمنا قال فبعثوا في أثره فوجدوه كذلك))

لە بارودۆخێکی تر، دەگێڕنەوە کە پیاوێک دێتە لای ئیبن عەباس و پێی دەڵێت: من چووم بۆ مارەکردنی ژنێک، بەڵام ڕازی نەبوو شووم پێ بکات، پاشان پیاوێکی تر چوو بۆ خوازبێنی و شووی بەو کرد. منیش ئیرەیی وایلێکردم کە ئەم ئافرەتە بکوژم. ئایا دەشێت تەوبە بکەم و لێم قبوڵ دەکرێت؟ ئیبن عەباس لێی پرسی: دایکت لە ژیاندا ماوە؟ گوتی: نەخێر. ئیبن عەباس پێی گووت: کەواتە تەوبە بکە و چەند پێت دەکرێ لە خودا نزیک ببەوە.. (البخاري في الأدب المفرد)

سەبارەت بەو مەرجانەی کە پێویستە لە کەسایەتی موفتیدا هەبێت، توێژەران ئاماژە بەم مەرجانە دەکەن: دەبێ موفتی موسڵمانێک بێت لە تەمەنی تەکلیف، جێگای متمانە بێت، نهێنی پارێز بێت، پاک بێت لەو تاوان وئ ەو شتانەی کە لە کۆمەڵگە نەگونجاون، زیرەک وعەقڵی چالاک بێت، ڕەفتاری دروست بێت و شێوازی بیرکردنەوەی باش بێت، وریا بێت و توانای ئەوەی هەبێت کە لە کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەتیش بگات وەک لاڵ و نابینا.

لە کتێبی (آداب الفتوى) النووي (١٩٨٨: ٤٦) دەنووسێت: ئەگەرئاستی تێگەیشتنی ئەو کەسەی داوای فەتوا دەکا باش نەبوو، ئەوا موفتی پێویستە لەگەڵی نەرم بێت و ئارام بگرێت هەتا فەتواخوازەکە بەتەواوی لە پرسیارەکە تێدەگات و لە وەڵامەکەش حاڵی دەبێت. هەروەها النووی دەنووسێت: موفتی بۆی نییە فەتوا بدات کاتێک ئاکاری بگۆڕێت و دڵی بە شتی تر سەرقاڵ ببێت، بەشێوەیەک ڕێی پێ نەدا کە تێڕامان بکات، بۆ نموونە توورەیی و برسێتی و تینێتی، خەم یان خۆشەیەکی لەڕادەبەدەر!، خەواڵوویی، بێزاری، یان جێگاکەی گەرم یان سارد بێت، یان نەخۆشییەکی ئازاربەخش، یان تەنگەتاو (تەنگاو) بێت، هەر بارودۆخێک کە

دڵی سەرقاڵ بکا و لە سنووری ئاسایی دەری بکات... (لا: ٣٨-٣٩). الحرانی (١٣٨٠) ئاماژە بە هەمان ئەم خاڵانە دەکات (لا: ٣٤).

دەتوانین بڵێین، موفتی پێویستە شارەزاییەکی قووڵی هەبێت لە بواری دەروونزانیدا، بەتایبەتی بواری کەسایەتی، بۆئەوەی بتوانێت بە دروستی لە ڕەهەندە دەروونییەکان تێبگات، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە حاڵەتی دەروونی و کەسایەتی فەتواخوازەوە هەیە. بەبێ بوونی ئەو جۆرە شارەزاییە دەروونییە، ئەگەری زۆرە کە موفتی تووشی هەڵە ببێت.

**کاریگەری فەتوا لەسەر دەروونی تاک**

دەکرێ لە سێ ڕەهەندەوە بڕوانینە کاریگەری فەتوا لەسەر دەروونی تاک:

- ڕەهەندی زانیاری
- ڕەهەندی سۆزداری
- ڕەهەندی ڕەفتاری

**یەکەم: کاریگەری فەتوا لەسەر ڕەهەندی زانیاری:**

دیارە مرۆڤ لەبەر کەمی یان نەبوونی زانیاری لەسەر بابەتێک یان بوونی زانیاری جیاواز لەسەر بابەتێک یان ڕووداوێک، داوای فەتوا دەکات، چونکە ئەگەر کەسەکە دڵنیا بێت لە زانیارییەکەی لەسەر حوکمی شەرعی بابەتێک، ئەوا پێویست بە پرسیارکردن و داواکردنی فەتوا ناکات. کەواتە فەتوا یان ئەوەتا زانیارییەکی تازەیە بۆ فەتواخواز یان دڵنیابوونە لە زانیارییەکی پێشوەختە. لە هەردوو حاڵەتدا، فەتواخواز لەڕووی زانیارییەوە دەوڵەمەندتر دەبێت.

**دووەم: کاریگەری فەتوا لەسەر ڕەهەندی سۆزداری:**

کەسی فەتواخواز هەست بە جۆرێک لە نیگەرانی و نائارامی دەکات، کاتێک دڵنیا نییە لە حوکمی شەرعی لەسەر بابەتێک، بەتایبەتی لە ڕووحی حەڵاڵ و حەرامەوە. کەسی ئاییندار هەستیارە سەبارەت بە لایەنی حەڵاڵی و حەرامی، کاتێک لە ڕێگای فەتواوە دڵنیا دەبێت، ئەوە لەڕووی سۆزداریەوە ئارامتر دەبێت و نیگەرانییەکانی کەمدەبنەوە. بەڵام لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ حاڵەتی فەتوای پێچەوانە بکەین، واتە فەتوایەک کارێک حەرام بکا وفەتوایەکی تری حەڵاڵی بکات، ئەم فەتوا دژەبەیەکە ئەگەری زۆرە کە نیگەرانی و دوودڵی کەسەکە زیاتر بکات. هەرچەندە لە ئیسلامدا هانی موسڵمان دەدرێت کە کارێک نەکات گومانی تێدا هەبێت، لەڕووی حەڵاڵ وحەرامەوە.





### سێیەم: کاریگەری فەتوا لەسەر ڕەهەندی ڕەفتاری:

دیارە کاتێک کەسێک داوای فەتوا لەسەر بابەتێکی بۆ نموونە بازرگانی دەکات، ئەگەری زۆرە کە مەبەست لێی تەنها زانیاری نەبێت، بەڵکو نیازی بێت ئەو بازرگانییە بکات ئەگەر فەتوای دەستکەوت کە حەڵاڵە، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر فەتواکە ئەم بازرگانییەی بە حەرام دانا، ئەوا ئەگەری زۆرە کە ئەم بازرگانییە نەکات. بۆیە ڕەهەندی ڕەفتاری یەکێک لە ئەنجامەکانی فەتوا، بە کردن و بە نەکردن.

### کاریگەری فەتوا لەسەر کۆمەڵگە:

فەتوا کاریگەری لەسەر کۆمەڵگە هەیە، هەرچەندە فەتوا دەگۆڕێت بە گۆڕانی کات و شوێن و کۆمەڵگە، بەڵام گرنگە ئاگاداری ئەوە بین کە ئامانجی فەتوا ئەوە نییە کە شەرعیەت بە هەر شتێکی نوێ بدات، ئەگەرچی بووبێتە بەشێک لە واقیعی کۆمەڵایەتیش. دەشێ سێ بواری سەرەکی دەسنیشان بکەین کە فەتوا کاریگەری لەسەر کۆمەڵگە جێدەهێڵێت و لە ئەنجامیشدا تاکەکانی باجەکەی دەدەن:

### یەکەم: بواری خێزان:

لە کۆمەڵگەی موسڵمانناندا خێزان ڕۆڵێکی گرنگی هەیە. دەبێ فەتوا بە ئاڕاستەی پتەوکردنی خێزان و شیرازەکەی بێت، بەڵام دەشێ هەندێ لە فەتواکان ببنە هۆی ئەوەی کێشە بۆ خێزان دروستبکات، بەتایبەتی ئەو فەتوایانەی کە هەندێ فۆرمی نوێ هاوسەرگیری بە دروست و ئاسایی دادەنێن. هاوسەرگیری مسیار نمونەیەکە لەو بوارە.

### دووەم: بواری ئابووری:

لە بواری ئابووریی و کارگێڕی و بازاڕ، بابەتی تازە هاتوونەتە ئاراوە. لێرەدا فەتوا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت کە ئایا ئەم جۆرە بابەتە تازانە دروستن (حەڵاڵن) یان نا؟ ئینجا ئەگەر کەسی فەتواخواز، لە ئەنجامی فەتوایەکدا، بگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم مامەڵە بازرگانییە دروست نییە (یان حەرامە)، ئەگەری زۆرە کە ئەم مامەڵە بازرگانییە نەکات، ئەوەش کەم یان زۆر کاریگەری لەسەر بارودۆخی ئابووری لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵگە دەبێت، بابەتی بیک تۆین نموونەیەکە لەم بوارە.

**سێیەم: بواری ئاسایشی کۆمەڵایەتی:**

ئاسایشی کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی لەو کۆمەڵگایانەی کە فرەئایین و فرەمەزهەبن، زۆر ناسکە. لە کۆمەڵگەی لەم شێوەیەدا پێویستە فەتوا ڕۆڵی پتەوکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی بگێڕێت. بۆیە هەر فەتوایەک ڕەوایەتی بە ڕەفتارێک بدات، بەتایبەتی ڕەفتارێک کە شەڕانگێز و توندوتیژ بێت و مافی پێکهاتەکان پێشێل بکات، ئەوا ئەو ڕەفتارە ئاسایشی کۆمەڵایەتی دەخاتە مەترسییەوە، فەتوای جیهاد نمونەیەکە لەم بوارە.

**دەرەنجام:**

ئەم توێژینەوەیە هەوڵیداوە کە تیشک بخاتە سەر ڕەهەندە دەروونییەکانی فەتوا. هەرچەندە فەتوادان پرۆسەیەکی ئاینییە، بەڵام ڕەهەندە دەروونییەکانی زۆر کاریگەر و گرنگن. سەبارەت بە کەسایەتی موفتی کۆمەڵێک خاسیەتی مەعریفی و کەسایەتی هەیە کە زۆر پێویستن بۆئەوەی بتوانێت بە دروستی پرۆسەی فەتوادان بەڕێوە ببات. لەهەمانکاتیشدا فەتواخواز لەڕووی پاڵنەر و کەسایەتییدا تایبەتمەندی خۆی هەیە.

سەبارەت بە کاریگەری فەتوا لەسەر تاک و کۆمەڵگە، دیارە کە فەتوا سوودی بۆ کەسی فەتواخواز هەیە لەڕووی زانیاریی و سۆزداریی و ڕەفتاری.. لەهەمانکاتدا فەتوا کاریگەرییەکەی دەگاتە سەر کۆمەڵگە و لەسەر لایەنەکانی خێزان و ئابووریی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی کاریگەری باش و خراپی دەبێت.

بەگشتی زۆر پێویستە کە موفتی شارەزاییەکی باشی هەبێت سەبارەت بە بابەتەکانی دەروونزانی، بەتایبەتی بواری پاڵنەرەکان و بواری کەسایەتی. ئەم شارەزاییە یارمەتی دەدات کە بەشێوەیەکی دروست فەتواکەی بدات و ئەنجامەکەشی لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵگەدا پۆزەتیڤ بێت.

## سەرچاوەکان


١. القرآن الكريم

٢. أبي زكريا يحيى بن شرف النووي (١٩٨٨) آداب الفتوى، والمفتي والمستفتي، دار الفكر: دمشق

٣. أحمد بن حمدان الحراني (١٣٨٠): صفة الفتوى والمفتي والمستفتي: منشورات المكتب الاسلامي: دمشق

٤. خالد محمد عبدالرؤف عمارة ( ٢٠٢٣) أثر الضغوط النفسية في الأحكام الفقهية، جامعة الأزهر ١-٢ (٣٨): ٥٤-١٥٦

٥. وليد بن على بن محمد القليطي العمري (١٤٤٣ ) الفتوى وضوابطها الشرعية وموقف المفتي من الفتاوى المعاصرة، مجلة جامعة طيبة للآداب والعلوم الانسانية، ٩(٢٥): ١٣٤-١٨١.

٦. عصام تليمة (٢٠٢٣) علم اجتماع الفتوى وفتاوى المشتغلين بالعلوم الإنسانية، موقع الجزيرة نت، https:// www.aljazeera.net/opinions/١٦/٧/٢٠٢٣

٧. موقع دار الافتاء المصرية: https://www.dar-alifta.org/ar/ViewFatawaConcept/٦٦.

٨. موقع دار الافتاء المصرية: https://ifta-learning.net/mofti٢٢٣?.

٩. ئازاد عەلی و سەرهەنگ ئیبراهیم: دەروازەیەک بۆ دەروونزانی گشتی. کتێبخانەی سۆفیا: کۆیە، ٢٠١٩.

10. Larsen, R.J. & Buss, D.M. (2008). Personality Psychology: Domains of Knowledge about Human Nature. Boston: McGraw-Hill.

فەتوا لە کورتترین پێناسەدا بریتییە لە ڕوونکردنەوەی بۆچوونی ئیسلام سەبارەت بە پرسێکی دیاریکراو. ئەم ڕوونکردنەوەیەش بنەما لەسەر کۆمەڵێک پێوەر و پێودانگ و هەنگاو و لێکۆڵینەوە بەپایان دەگات، هەر لە سەرەتای سەدەی یەکەمی کۆچییەوە تاکو ئێستا بە زۆر قۆناخ و شێواز تێپەڕیوە، بەپێی کات و شوێن و زەمینەی هاوچەرخ گۆڕان لەو پێوەر و پێودانگانە لەلایەن کەسانی پسپۆڕ لە بوارەکە ئەنجامدراوە، بەمەبەستی ڕێکخستنەوە و جێبەجێکردنی ڕۆحی دەق و مەبەست و پەیامەکانی لەپێناو هێنانە کایەی زەمینەیەکی دینداری ئارام و ڕوون و بێ گرێ و گاڵ.

لە دونیای هاوچەرخ و لە چاخی پڕ ئاڵنگاری و پێشهاتی خێرا و گۆڕانکاری لە سەرووی چاوەڕوانی بەشێک لە مرۆڤایەتی بەتایبەت جیهانی سێیەم، فەتوادان پشکێکی گەورەی بەرکەوتووە لە ئاڵۆزی، کە پێویستی کردووە و پێویستیش دەکات چاوخشاندنەوە بە ڕێکار و شێوازەکانی فەتوادان بکرێت، بە ئامانجی ڕێکخستنەوە و جێبەجێکردنی پەیامی ئاینداری بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ زەمینەی کار و چالاکی هاوچەرخ، هەروەها لەپێناو دانەبڕانی پرۆسەی ئاینداری لە واقیعی هاوچەرخ.

کارکردن لەسەر ڕێکخستنەوەی پرۆسەی فەتوادان، کاری تاکەکەسی نییە، بەڵکو پێویستی بە هەوڵی دەستەجەمعی و هەنگاوی کردەییە لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خانە و ئەنجومەن و لیژنەکانی فەتوادان و ناوەندە ئەکادیمییەکانی تایبەت بە پرسی ئایین و ئاینداری وەک زانکۆ و پەیمانگا و سەنتەرە ئەکادیمییەکان کە لەم بوارە کاردەکەن. لەم وتارەدا بۆچوونی کەسی خاکەڕاییانەی خۆم سەبارەت بەم پرسە دەخەمەڕوو، بەلەبەرچاوگرتنی واقیعی کوردستان و ئەو شێوازە فەتوادانەی کە ئێستا هەیە، هەروەک چەند سەرەقەڵەمێک سەبارەت بە ئاسۆی چارەسەری دەخەمەڕوو.

بەرکۆڵ:

سەرەتا بەپێویستی دەزانم، بە پوختی دۆخی فەتوادان لە کوردستان لەچوارچێوەی بەدامەزراوەییکردنی سەرجەم جەمسەرەکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە بخەینەڕوو، ئینجا قسە لەسەر ئاسۆکانی ڕێکخستنەوە و ئاڵنگارییەکان بکەین.

پێش دامەزراندنی دەوڵەتی مۆدێرنە لەسەر میراتی دەوڵەتی عوسمانی، لە کاروبارە مەدەنییەکان بەشێوەیەکی فەرمی (مجلە الأحکام العدلیە) وەک سەرەکیترین بنەماکانی دادبینی لەسەر ئاستی دەوڵەت پشتیپێبەستراوە، دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی و هاتنەکایەی شانشین و کۆمەڵێک دەوڵەتی نەتەوەیی و تێکەڵ لە کۆمەڵە نەتەوە، دۆخەکە گۆڕانی ڕیشەیی بەسەر داهاتووە، لەسەر ئاستی عێراق لەڕووی یاساییەوە گۆڕانکاری گەورە لە دوای ڕاگەیاندنی کۆمار و کۆتاییهاتنی حوکمی پاشایەتی ڕوویداوە. تاکو ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو، لەسەر ئاستی ویلایەت و پارێزگا و شار و گوندەکان بوونی یاسا و دادگا کەمتر هەستیپێکراوە، بە ئاستێکی باڵا ئاغا و دیوەخان و مەلا و مزگەوت لە بەلاداخستنی کێشەکان ڕۆڵیان هەبووە، مەزهەبی سەرەکیش لە حوکمدان لەسەر زۆربەی پرسەکان هەر شافیعی بووە.

لە سەردەمی پاشایەتییەوە هەتا کۆماری لە عێراق کار لەسەر ئەوەکراوە یاساناسان زۆربەی لایەنەکان بە یاسا ڕێکبخەن، دەرچوونی یاساکانی: (سزادان، شارستانی، بازرگانی، کشتوکاڵی و باری کەسی ... هتد) لەپێناو ڕێکخستنەوەی ئەو لایەنانە بووە، لەکاتێکدا کۆی پڕۆسەکە لەلایەک بۆ ڕێکخستنەوەیە، لەلایەکی تر تێپەڕکردنی دۆخی خێڵ و عەشیرەت و نا دەوڵەت بووە بۆ گەیشتن بە قۆناغی دەوڵەتی مەدەنی و دامەزراوەی یاسایی، ئەمەش کەمکردنەوەی هێزی ئایین و مەلا و مزگەوت و لاوازکردنی بڕیاری ئاغا و کوێخا و دیوەخانی لێکەوتووەتەوە، چونکە لە سەردەمی پێش هاتنەکایەی دەوڵەتی نەتەوەیی لە سەدەی بیستەم، بەشێوە فەرمییەکە (مجلەی ئەحکامی عەدلی) و بە نافەرمیش ئاغا و دیوەخان و مەلا و مزگەوت و شێخ و تەریقەت و گەورەپیاوانی ئایینی لە یەکلاکردنەوەی کێشە و پرسەکان ڕۆڵی گەورە و یەکلاکەرەوەیان بینیوە، هەربۆیە پەرتوکەکانی فیقهی ئیسلامی لە سەرجەم مەزهەبەکان بەسەر چەند کۆباس دابەشکراون، وەک: (پاکوخاوێنی، خواپەرستی، کڕین و فرۆشتن و مامەڵە داراییەکان، باری کەسی، تاوان و سزا ... هیتد) پەیکەری یاساش لەسەر هەمان شێواز داڕێژراوە.

ئەگەر تەماشای پەیکەری یاساکانی عێراق بکەین، وەک بەدیل و کۆپی پەرتووکەکانی فیقهی ئیسلامی، بەڵام بە پاشخانی جیاواز و ئامانجی جیاواز و دیدگای جیاواز دەردەکەون، بۆ نموونە: (یاسای سزادان لە بری قانوونی جینایات،

یاسای شارستانی و بازرگانی لەبری کڕین و فرۆشتن و مامەڵە داراییەکان (معامەلاتی مالی)، یاسای باری کەسی لە بری ئەحکامەکانی زەواج و تەڵاق و نەفەقە و حەزانە و میرات و وەسیەت ... هتد)، ئەم یاسایانە جگە لە یاسای باری کەسی هیچیان ڕاستەوخۆ هەڵقوڵاوی فیقهی ئیسلامی نین، بەڵکو لە بەشێکیان بنەما سەرەکی و نەگۆڕەکانی فیقهی ئیسلامی لە پەراوێزی سەرچاوەکان یان وەک سەرچاوەی لاوەکی بەکارهاتوون.

تاکە لایەنێک کە یاسا خۆی لەقەرەنەداوە بە فەرمی ڕێکی بخات تەنیا لایەنی خواپەرستییە، بەواتایەکی تر ئەو خواپەرستییانەی ڕەهەندی کەسییان هەیە، کە بریتییە لە پەیوەندی نێوان خودا و بەندە، وەک نوێژ و ڕۆژوو و شێوازەکانی خواپەرستی، لەوێش کۆمەڵێک لە قاڵبدان بەمەبەستی ڕێکخستنەوە هەیە لەڕێگەی ڕێنماییەکانەوە، ئەگەرچی یاسا بە فەرمی خۆی لێ لاداوە.

**سیاسی و یاسادانەرانی عێراق بە هەنگاو ڕۆڵی کارایان گێڕاوە لە کەنارخستنی ئایین و دامەزراوە ئایینییەکان، جگە لە هەبوونی وەزارەتی ئەوقاف یان دیوانی وەقفی سوننی و شیعی هیچ دامەزراوەیەکی فەرمی وەك خانەی فەتوادانی فەرمی نییە.**

بنەما لەسەر ئەم ڕوونکردنەوەیەی سەرەوە، کە باسی پرسی فەتوادان دەکرێت، بە پلەی یەکەم پرسەکانی خواپەرستییە، بەپێچەوانەوە بابەتەکانی سزادان و مامەڵەدارایی و بازرگانییەکان، تەنانەت باری کەسیش بە یاسا ڕێکخراون، تەنیا بۆ دڵنیابوونەوەی زیاتر و ئارامی دڵ و فێنکی ڕۆح، لەچوارچێوە و ڕەهەندە قیامەتییەکە خەڵک دەگەڕێتەوە بۆ وەرگرتنی بۆچوونی ئایین و مەلا و موفتی، بەپێچەوانەوە بەخۆلادان لە پرسی قیامەت و حەڵاڵ و حەرام، کە تەواو پرسێکی پەیوەستە بە قیامەت، هیچ پێویستییەکی خەڵک بە موفتی نەماوە، ئەمەش بەتەواوی ڕۆڵی مەلا و موفتی لە کۆمەڵگە لاواز کردووە.

بەواتایەکی تر، بەدەر لە ڕەهەندی قیامەتی (بەشی خواپەرستی و کۆباسەکانی پەیوەست بە حەڵاڵ و حەرام)، لایەنەکانی تر یاسا قسەی کۆتایی تێداکردووە و بەلایداخستووە، بەڵام لە پرسە خواپەرستییەکان بۆ ئەهلی خۆی جێهێڵراوە کە بریتییە لە مزگەوت و مەلا و موفتی و ئەنجومەنی باڵای فەتوا و لیژنەکانی فەتوادان و پیاوانی ئایینی.

بە یاساکردنی سەرجەم لایەنەکانی کۆمەڵگە لایەنی ئەرێنی و نەرێنی هەیە، لایەنە ئەرێنییەکەی بۆچوونێک دەکاتە فەرمی بۆ بەلاداخستنی پرسەکان لە کاتی کێشە و دادبینی، لە فیقهی ئیسلامیش هەر لە کۆنەوە وتراوە: (أمر الإمام يرفع الخلاف)، بەو واتایەی لەو پرسانەی ڕاجیایی لەسەرە، قسەی دەسەڵات و دادگا ڕاجیایی کۆتایی پێدێنێت. بەواتایەکی تر، ئەگەر لەسەر پرسێک بۆچوونی جیاواز هەبوو، ئەو کاتەی دەسەڵاتی بڕیاردان و یاسادانەر بۆچوونێکی بە فەرمی وەک یاسای بەرکار ناساند، تەنیا کار بەو بۆچوونە دەکرێت و بۆچوونەکانی تر لە پرۆسەی دادبینی هیچ سەنگ و قورساییەکیان نامێنێت. لایەنە نەرێنییەکەشی ئەوەیە، بەشێک لە پەیڕەوکارانی ئایینی (لەڕووە دینداریيەکەوە) پابەندنابن بە بۆچوونێک کە بڕوایان پێی نییە، بۆ نموونە: ئەستەمە باوەڕ بە شافعی مەزهەبێک بکەیت لە پرسی زەواج و تەڵاق پابەندی مەزهەبی حەنەفی یان ئەهلی حەدیس بێت، تەنانەت ئەگەر بۆچوونەکە بە یاساش کرابێت، ئەستەمترە بتوانی قەناعەتی پێبکەی پابەندی مەزهەبی جەعفەری و شیعەی ئیمامی ببێت، ئەمە بۆ پەیڕەوکارانی سەرجەم مەزهەبەکان بەشێوەیەکی ڕێژەیی ڕاستە.

سیاسی و یاسادانەرانی عێراق بە هەنگاو ڕۆڵی کارایان گێڕاوە لە کەنارخستنی ئایین و دامەزراوە ئایینییەکان، جگە لە هەبوونی وەزارەتی ئەوقاف یان دیوانی وەقفی سوننی و شیعی هیچ دامەزراوەیەکی فەرمی وەک خانەی فەتوادانی فەرمی نییە، هەر لە سەرەتای ڕێکخستنەوەی یاسای باری کەسی، قازی شەرعی کە بریتی بووە لە مەلا یان موفتییەکی ناودار ڕۆڵی لە یەکلاکردنەوەی پرسەکانی زەواج و تەڵاق و نەفەقە و حەزانە و میرات و وەسیەت بینیووە، بەڵام دوای قوڵکردنەوەی یاساکە و ناچارکردنی سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگە بە پابەندبوون پێیەوە، بەهەنگاو قازی شەرعی بوونی نەما، وەک باقی بەشەکانی تر دادوەرێکی دەرچووی یاسا دادەنرا، وەک ئەداتی جێبەجێکردنی یاسای باری کەسی و وەک پرسێکی یاسایی

ڕووت سەیری یاساکە و لێکەوتەکانی دەکرێت، هەر ئەمە هۆکارێکی سەرەکییە کە هێندەی خەڵکە ئایندارەکە لە زەواج و تەڵاق دەگەڕێتەوە بۆ لای موفتی و ئەنجومەنی باڵای فەتوا و لیژنەکانی فەتوا و مامۆستایانی ئاینیی هێندە ناچێتە ژێر باری یاسا و دادگاکان، تەنانەت لە ژن مارەکردن هەتا لای مەلا مارەبڕنەکرێت قەناعەت بە مارەکردنی لای دادوەر ناکەن. هۆکاری سەرەکیش ئەوەیە پرسەکانی (باری کەسی) ڕەهەندی خواپەرستیان هەیە، هەربۆیە بەرلەوەی خاوەنپرس بیر لە یاسایی بوون و نایاسایی بوون بکاتەوە بیر لە دروست و نادروست دەکاتەوە لە ڕوانگەی شەرع و ئایینەوە.

کەواتە، بە پوختی ئەوەی سەبارەت بە فەتوا و یەکخستنەوە و ڕێکخستنەوەی فەتوا دەگوترێت، تەنها ئەوپرسانە دەگرێتەوە کە بە یاسا ڕێکنەخراون لەلایەک، دووەم ڕێکخستنی بۆچوونی ئەهلی فەتوا و حەسمکردنی بۆچوونە جیاوازەکان بۆ هەماهەنگیکردن لەگەڵ دامەزراوە یاساییەکان سەبارەت بەو پرسانەی ڕەهەندی ئاینداریی و خواپەرستیان تێدا زاڵە، لەپێناو پاراستنی مافەکان و جێبەجێکردنی ڕۆحی دەقە ئاینییەکان و هێنانەدی مەبەستە باڵاکانی شەرع و دین.

**فەتوا و یاسا**

فەتوا و یاسا خاڵی بەیەک گەیشتن و جیاوازیان هەیە، سەرەتا پێویستە ئاماژە بەوەبدەین کە خاڵی بەیەکگەیشتنی فەتوا و یاسا بریتییە لە ڕوونکردنەوەی بۆچوون سەبارەت بە پرسێکی دیاریکراو، یەکەمیان بۆچوونی شەرع و دووەمیان بۆچوونی یاسا، خاڵی سەرەکی جیاوازیشیان لەڕووی پابەندبوون دەردەکەوێت، کە فەتوا تەنیا ڕوونکردنەوەیە و تایبەتمەندی ئیجباری پابەندبوونی نییە بەپێچەوانەی یاسا (حوکمی دادگا) کە پابەندبوون ئیجبارییە.

بەواتایەکی تر کەسێک کە داوای فەتوا دەکات، دوای ئەوەی فەتوایەکەی وەرگرت لەڕووی پابەندی دونیاییەوە مەرج نییە پێیەوە پابەند بێت، بەپێچەوانەوە هەرکات دادگا بڕیاری لەسەر پرسێکی دیاریکراودا پێویستە ئەوکەسەی حوکمەکەی بۆ دراوە پێیەوە پابەند بێت. بنەما لەسەر ئەم جیاوازییە فەتوابۆدراو بە ئاسانی و ئاسایی دەتوانێت فەتواکە ڕەتبکاتەوە و ڕوو لە موفتییەکی تر بکات بۆ وەرگرتنی فەتوایەکی تر، لەو کاتەی کە فەتواکە لە ئاستی داخوازی و چاوەڕوانی ئەو نەبێت یان تەریب نەبێت لەگەڵ قەناعەت و ئەو مەزهەبەی پەیڕەوی لێدەکات، بەپێچەوانەی

حوكمی دادگا تەنیا مافی تانەلێدانی هەیە نەوەک دادگا گۆڕین و ڕەتكردنەوەی یەكجارەكی حوكمەكە.

نەبوونی مەرجی ئیجباری پابەندبوون بە فەتوا هۆكاری سەرەكی دروستبوونی خانە و ئەنجومەن و لیژنەی جۆراوجۆرە، كە هەریەک لەمانە بنەما لەسەر كۆمەڵێک پرەنسیپی جیاواز فەتوادەدەن، هۆكاری سەرەكی جیاوازی پرەنسیپ و پێودانگەكان بریتییە لە دیدگا و قوتابخانە و ئاڕاستەی هزریی و مەزهەبی جیاوازە، لەپێناو یەكخستنەوەی پرۆسەكە و دروستكردنی نیمچە كۆدەنگی لەسەر پرسی فەتوادانی فەرمی پێویستە لەسەر چوار ئاستی سەرەكی كاربكرێت، لە خوارەوە بە پوختی لە خوارەوە ئاماژەیان بۆ دەكەین:

یەكەم: خەڵک و كۆمەڵگە: سەنگی داننان بە خانە و لیژنە و سەكۆ و موفتی خەڵک و كۆمەڵگەیە، ئامانج لە فەتوادان ئاڕاستەكردنێكی دروستی تاک و كۆمەڵە بۆ ژیان و گوزەركردن لەسەر شێوازی ئاییندارى دروست، لەم پێناوەدا بڕوای خەڵک حوكم دەكات لە ڕووكردنە لیژنە یان سەكۆیەكی دیاریكراوی فەتوادان، هەربۆیە زۆرجار ئاییندار هێندەی ڕوو لە مامۆستایەكی ئایینی ناسراوی خۆی دەكات (كە خۆی قەناعەتی پێی هەیە) بەمەبەستی فەتوالێوەرگرتن، هێندە ڕوو لە خانە و ئەنجومەن و سەكۆ فەرمییەكانی فەتوادان ناكات، لەبەر دوو هۆكاری سەرەكی:

ئەلیف/ ئەو كەسەی لە نزیكەوە دەیناسێت و شارەزای ئاكار و گوفتاریەتی باشتر كاریگەری لەسەر قەناعەت و بۆچوونی دروستدەكات.

باو/ ڕێكاری دەستگەیشتن بە ناسیاوەكە زۆر ساناتر و بەردەستترە هەتا دەگاتە ئەنجومەن و سەكۆیەكی فەرمی.

هەر ئەمەش بەدیوێكی تر، هۆكاری سەرەكی دروستبوونی پاشاگەردانییە لە فەتوا لەبەر چەند ڕێكارێكی تر گرینگترینیان:

زۆربەی ئەو كەسانەی داوای فەتوا دەكەن توانای مەعریفی و زانستیان لەو ئاستەدا نییە بتوانن موفتی و مەلایەكی ئاسایی یان بانگخواز و گوتاربێژێكی ڕەوانبێژ لەیەک جیابكەنەوە، هەروەها لاوازی ئاستی هەستكردن بە بەرپرسیاریەتی لەلایەن بەشێكی زۆری بەناو موفتییەكان (بەتایبەت فەقێ و مەلای ئاسایی و بانگخواز و وتاربێژ) كە بەڕاست و چەپ زۆربەی ئەو پرسیارانەی بەمەبەستی دەستكەوتنی

فەتوا و حوکمی شەرعی ئاڕاستەیان دەکرێت وەڵامدەدەنەوە، بێ ئەوەی سڵ لە چارەنووس و سەرەنجامی فەتوادانەکەیان بکەنەوە، لەکاتێکدا پرۆسەی فەتوادان پرۆسەیەکی قورس و ئاڵۆزە و ناکرێت بەسەرپێیی و بێ وردبوونەوەی قوڵ بڕیاری لەسەر بدرێت، بەشێکیشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بەشێک لە ئاییندارا‌ن بەهۆکاری جیاجیا هێندەی متمانەیان بە کەسایەتییە ئایینییەکان و بەشێک لە وتاربێژان هەیە و ڕووی فەتوا لەوان دەکەن هێندە متمانەیان بە ئەنجومەن و سەکۆ و لیژنە فەرمییەکانی فەتوادان نییە.

کەواتە؛ کاری لەپێشینە بریتییە لە گێڕانەوەی متمانە لە نێوان دامەزراوە فەرمیی و نیمچە فەرمییەکانی فەتوادان و خەڵک و کۆمەڵگە، لەبەر دوو مەبەست:

ئەلیف/ بۆئەوەی ئەم لایەن و سەکۆیانە ببنە ڕووگەی زۆرترین خەڵک و زۆربەی ئەوانەی پێویستیان بە فەتوایە ڕوو لەوان بکەن.

باو/ گێڕانەوەی شکۆی ئەو دامەزراوانە و سەنگ و قورسایی فەتواکانیان لەناو کۆمەڵگە.

بەدەر لەم زەمینەسازیی و گێڕانەوەی متمانەیە، دامەزراوەی فەرمی فەتوادان هەشبێت بەهایەکی ئەوتۆی نابێت لە زەمینەی کردار، چونکە عیبرەت لە جێبەجێکردن و پابەندبوونە نەوەک فەتوایەک کە تەنیا مرەکەبی سەر کاغەز بێت، بە واقعیش ئەمەمان لە بەشێک لە فەتواکان بینیوە، کە بەشێکی خەڵکی دیندار ڕەتیکردووەتەوە و ئامادە نەبووە جێبەجێی بکات، بەپاساوی سیاسی بوونی فەتواکە یان هەر هۆکارێکی تر ڕەتیکردووەتەوە، ئەگەرچی زۆرجار هەڵەتێگەیشتن بووە لە فەتواکە و هیچ ڕەهەندێکی ناجۆر لە پشتی فەتواکە نەبووە.

دووەم: یەکخستنی جەمسەرەکانی فەتوا: سروشتی مرۆڤەکان، وەک شاکارێکی خودایی، جیاوازە. جیاوازی لە بیروبۆچوون و تێگەیشتن و هێزی تێگەیشتن و پەیبردن بە ناوەرۆک و مەبەستی دەقەکان لێکەوتەی جیاوازی سروشتی مرۆڤە، بنەما لەسەر ئەم جیاوازییە مەزهەبی فیقهی و قوتابخانەی هزریی و مەعریفی هاتوونەتە ئاراوە، هیچ یەکێک لەو مەزهەب و قوتابخانانەش بەدەر نەبوون لە کاریگەری ژینگە و دابونەریت و کولتوور، هەربۆیە بە ئەندازەی زۆری ئەم جیاوازییە و فراوانی مەودای جیاوازییەکان، فرەجەمسەری لە پرۆسەی فەتوادان هاتووەتە کایەوە.

ئەگەر هەتا کۆتایی سەدەی بیستەم لە کوردستان مەزهەبی شافیعی چەتری کۆکەرەوەی ئایندارانی بووبێت، ئێستا کۆمەڵێک مەزهەب و ئاینزای تر لەپاڵ مەزهەبی شافیعی پەیڕەودەکرێن، بۆ نموونە، لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو، پەیڕەوکانی مەزهەبی حەنبەلی لەژێر ناوی سەلەفی لە کوردستان تەشەنەیەکی بەرچاوی کردووە، دواتر ئەوانیش لە نێوان خۆیان بەسەر چەند تەیار و ئاراستەی جۆراوجۆری فیقهی و هزری دابەشبوون و ناوی جۆراجۆر و تەنانەت ناجۆریش کەوتنە بەرباس، هەتا کار گەیشتە ئەوەی بە شوێنکەوتەی کەس و موفتی خەلیج و یەمەن و سوریا دەناسرانەوە.

لەئەنجامدا بەریەککەوتنێکی زۆر توند لە نێوان پەیڕەوکارانی مەزهەبی حەنبەلی (بەناو و ڕەوتە جیاوازەکانەوە) مەزهەبی شافیعی هەتا ئاستی ئێسکشاندن (ئەگەر تەعبیرەکە دروست بێت) ڕوویدا، بەهۆی کۆمەڵێک هۆکاری بابەتی و کەسی و سیاسی لەگەڵ سەرهەڵدانی داعش بەریەککەوتنەکە خاوبوویەوە، دوای داعش شەپۆلی شیعەگەرایی هێمنتر لە سەلەفیەت خەریکە لە ئاستە هزریی و جەماوەرییەکە ململانێ لەگەڵ پەیڕەوکارانی مەزهەبەکانی تر دەکات، لەسەر ئاستی عێراق و کوردستان، لەژێر چەتری تەریقەت خەریکە تەشەنەیەکی خێرا دەسەنێت و لە بۆنە و مەراسیمەکانی عاشورا زەقتر هەستپێدەکرێت. ئەگەر کار وابڕوات، ململانێکە لەچوارچێوە هزریی و جەماوەرییەکە تێبپەڕێت، بەدڵنیاییەوە ململانێی مەزهەبیش دەستپێدەکات، ئەو کات لەبری ململانێی لەسەر حوکمی یەزید و شۆڕشی ئیمام حوسێن، ململانێ لەسەر ڕەوایەتی مەهزەبی جەعفەریی و شافیعی دەستپێدەکات، ئەو کات دۆخەکە زۆر لەوە ئاڵۆزتر دەبێت لەوەی کە ئێستا هەیە.

لە ئێستادا، کە لە چەند شوێنی تریش پسپۆڕانی بواری زانستە ئیسلامییەکان و پرۆسەی فەتوادان، جەختیانکردووەتەوە لەسەر تۆکمەکردنی ئەنجومەنی باڵای فەتوا و بە یاساکردنی، لەپێناو بەهێزکردنی پێگەی ئەنجومەنەکە و وەرگرتنی شەرعیەتی یاسای فەتواکانی، سەرەنجام دەبێتە دەمڕاستی فەرمی یەکلاکردنەوەی پرسە دینداریییەکان و قسەی کۆتایی لەسەر ئەو پرسانەی لێوەردەگیرێت کە ڕەهەندی دینداریان هەیە.

هەنگاوی سەرەکی دروستکردنی کۆدەنگی یان نیمچە کۆدەنگی کۆمەڵگە لەسەر فەتواکانی ئەنجومەنی باڵای فەتوا، دووبارە داڕشتنەوەی پەیکەری ئەنجومەنەکەیە

بەشێوەیەک بەسینەفراوانتر ئەندامانی ئەنجومەنەکە دیارییبکرێن و جێگەی کەسانی تری دەرەوەی مەزهەبی شافعیشی تێدا بکرێتەوە، لەپێناو حەسمکردنی جیاوازی بۆچوونە فیقهییەکان لەناو ئەنجومەنەکە لەبری شەقام و مزگەوت و کۆمەڵگە. هەمیشە ئەوەی بەگفتوگۆ و لێکتێگەیشتن و گەنگەشەی ڕاستەوخۆی دەمڕاستی مەزهەب و ڕەوت و قوتابخانە جیاوازەکان بەدەستدێت، بە دورەپەرێزیی و هەوڵی سڕینەوە و یەکتر نەخوێندنەوە بە پایان ناگات.

ئەوەی لەم قۆناغە پێویستە ئەنجامبدرێت، فراوانکردنی ئەنجومەنی باڵای فەتوا و دەرفەت ڕەخساندنە بۆ پەیڕەوکارانی مەزهەبانی تر (بەتایبەت حەنبەلی)، هەروەها ئەو کەسانەی ڕۆڵی موفتی دەگێڕن و لە دامەزراوە و ڕێکخراو و دەزگاکان فەتوا بۆ خەڵک دەدەن و مەرجەکانی فەتوادان و موفتیان تێدایە، بەم هەنگاوە قۆناغێک لە فرەجەمسەری دووردەکەوینەوە و نیمچەکۆدەنگییەکی ئایندارانی بەدەستدێت لەسەر شەرعیەتی فەتواکانی ئەنجومەنی باڵای فەتوا و لێژنە و لقەکانی لەسەرتاسەری کوردستان.

سێیەم: دامەزراوە فەرمییەکان: دوای لەقاڵبدانی فرەجەمسەری لە فەتوادان و نزیککردنەوەی زۆرینەی لایەنەکان و کۆکردنەوەی دەمڕاستەکانیان لە ئەنجومەنی باڵای فەتوا، دەکرێ وەک هەنگاوێکی کردەیی دروستکردنی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە نێوان ئەنجومەنەکە و دامەزراوە فەرمییەکان سەیربکرێت.

بە ئەزموون وەرگرتن لە خانەی فەتوای وڵاتانی تر، پەیوەندییەکی تۆکمە لە نێوان خانەی فەتوا و دامەزراوەکانی تری دەوڵەت هەیە، بۆ نموونە: لە وڵاتی میسر تاوەکو ئێستاش زۆرینەی بڕیارەکانی دادگا، تەنانەت بە بڕیارەکانی بەشی سزادانیشەوە، بەبێ تێپەڕبوون بە خانەی فەتوا و شێخی ئەزهەر ڕەتنابن و جێبەجێناکرێن، بەڵام لە کوردستان هەماهەنگی نیمچە فەرمی تەنیا لە نێوان ئەنجومەنەکە و دادگای باری کەسی هەیە، لە پرسەکانی تر ڕۆڵێکی ئەوتۆ بە ئەنجومەنەکە نەدراوە، لەکاتێک پێویستە لەبەشەکانی تری یاسایش بەتایبەت لە یاساکانی شارستانی و بازرگانیش هەماهەنگی تەواو هەبێت، بەتایبەتتر لەو پرسانەی پەیوەندی بە ئەحکامە تەکلیفییەکانەوە هەیە (کۆباسەکانی حەڵاڵ و حەرام).

لەڕووی ڕێکارییەوە دروستکردنی ئەم هەماهەنگییە لە بەرژەوەندی دامەزراوە

فەرمییەکانە، چونکە ئەنجومەنی باڵای فەتوا یارمەتیدەرێکی زۆرباش دەبێت لە سوککردنی ئەرکی دادگاکان، بۆ نموونە: کەیسێکی تەڵاق ئەگەر لە دادگا بە شەش مانگ حەسم بکرێت و بەلادابخرێت، لە ئەنجومەنی باڵای فەتوا ڕەنگە بە مانگێک یان کەمتر یەکلابکرێتەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەگەر فەتوای ئەنجومەنەکە وەک بڕیاری دادگا ئیعتباری یاسایی هەبێت و تەنیا بۆ پەسەندکردن خاوەن پرس ڕوو لە دادگا بکات، لۆدێکی زۆر لەسەر دادگاکان کەمدەبێتەوە و خەڵکێکی زۆریش بەوپەڕی قەناعەتەوە لە نێوان ئەنجومەنی فەتوا و دادگا ڕوو لە ئەنجومەنەکە دەکەن، چۆن لە مارەبڕین تا لای مەلا ئەنجامی نەدەن ڕوو لە دادگا ناکەن، بەهەمان شێوەش ئەنجومەنی باڵای فەتوا و لیژنە و لقەکانی زیاتر دەبنە ڕووگەی خەڵک لەو پرسانەی ڕەهەندی ئاینداریيان تێدا زاڵە.

ئەم جۆرە هەماهەنگی و ئیعتبارە یاساییە دەبێتە دەرچە بۆ یەکخستنی جەمسەرەکانی فەتوادان لە کۆمەڵگە، چونکە ئەگەر تەنها فەتوای ئەنجومەنی باڵای فەتوا لەلای دامەزراوە فەرمییەکان جێگەی بایەخ بێت، ئەو کات ئایندارران پەیتا پەیتا ڕوو لە ئەنجومەنەکە دەکەن بەهۆی نیمچە فەرمیبوونی فەتواکانی و هەماهەنگییەکەی لەگەڵ دامەزراوەکان، بەپێچەوانەوە موفتی دامەزراوە و ڕێکخراو و حیزب و کەناڵ و ڕادیۆ و دەزگاکان کەمتر دەبنە ڕووگەی خەڵک و فەتواویستان.

لەلایەکی تر، لەڕووی کوالێتی فەتواکانی ئەنجومەنی باڵای فەتوا و شێوازەی داڕشتنیان گرنگی زۆر زیاتریان پێدەدرێت، چونکە وەکو ڕێنمایی و بڕیاری نیمچەفەرمی سەیردەکرێن، ئیعتبارێکی تریان لای خەڵک و دامەزراوە فەرمییەکان دەبێت، ئەو کات لەڕووی ڕێکاریی و شێواز و شکلیاتی فەتوا ڕێکاری تەواو دروست و تۆکمە دەگیردرێتە بەر.

چوارەم: لە ڕوانگەی یاسا و ڕێنماییەکان: لەم چەند ساڵەی دوایی لە بەشێک کۆنفرانس و سیمپۆزیۆم و سمینار و کۆڕباس لە پێویستی هەبوونی (خانەی فەتوا – دار الافتاو)ی فەرمی کراوە، زانای کۆچکردوو (د.مستەفا زەڵمی)یش پرۆژەیەکی پێشکەش بە ئەنجومەنی وەزیران کردبوو سەبارەت بە دروستکردنی خانەیەکی لەم چەشنە، چەند هەوڵی تری کەسی و دەستەجەمعیش بۆ ئەو مەبەستە نراون، بەڵام تاوەکو ئێستا بە فەرمی دامەزراوەیەکی لەم چەشنە لەدایک نەبووە، بەوئومێدەی لە داهاتوویەکی نزیک ئەو خەونە ببێتە واقیع و کوردستان ببێتە خاوەنی خانەی

فەتوایەکی فەرمی.

کەواتە، لەکوردستان لەڕووی یاساییەوە، هیچ دامەزراوەیەکی فەرمی تایبەت بە فەتوای نیە، ئەوەی هەیە وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینییە، لەژێر چەتری ئەم وەزارەتە یەکێتی زانایانی کوردستان جێیکراوەتەوە، لەناو ئەم یەکێتییەش ئەنجومەنی باڵای فەتوا.

هەرچەندە بەشێکی زۆری پسپۆڕان هەبوونی ئەنجومەنەکە بە بەهێزی و ئیعتباری دینداریی و کۆمەڵایەتی بەپێویست دەزانن، ئایا دامەزراوەیەکی سەربەخۆی یاساییە یان نا بەگرنگی نازانن، ئەگەرچی شەرعیەتی هەر دامەزراوەیەک و بەهێزبوون و جێبەجێکردنی بڕیارەکانی لە شەرعیەتە یاساییەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت، بەحوکمی ئەوەی ئەنجومەنی باڵای فەتوا لەچوارچێوەی یەکێتی زانایان و دواتر وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی ڕەوایەتی وەرگرتووە و توانیویەتی بەکردەیی خۆی بسەلمێنێت، وەکو دامەزراوەیەکی یاسایی لە ئەرزی واقیع ڕۆڵدەگێرێت.

لە دوو ساڵی ڕابردوو، هەوڵی جدی لەسەر ئاستی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی نراون بۆ یەکخستنەوەی پرۆسەی ئایینداری لە کوردستان، گرنگترینیان دەرکردنی ڕێنمایی بوو بۆ ناساندنی مەزهەبی شافیعی وەک مەزهەبی فەرمی کوردستان، ئاشکرایە هێزی ڕێنمایی لەڕووە یاساییەکەوە زۆر لاوازترە لە یاسا، بەڵام لە بەرانبەر هەبوون و نەبوونی ڕێنمایی، بەدڵنیاییەوە دەرچوواندنی ڕێنماییەکە و بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەی وەقائیعی کوردستان و گشتاندنی بۆ سەرجەم بەڕێوەبەرایەتی و تێبینەرایەتییەکانی ئەوقاف بەمەبەستی جێبەجێکردنیان لە مزگەوتەکان هەنگاوێکی دیار و جۆری بووە، بەراورد بە ڕابردوو.

دوای دەرکردنی ئەم ڕێنماییانە، ئەگەر لە ڕابردوو ئازادی ڕەها هەبووبێت لە پەیڕەویکردن لە مەزهەبێکی تری جگە لە مەزهەبی شافیعی، لەڕووی یاساییەوە پێویستە دوای ئەم ڕێنماییانە تەنها مەزهەبی شافیعی لە پرسە خواپەرستییەکان لەناو مزگەوتەکان پەیڕەوبکرێت، ئەگەرچی جێبەجێکردنی ڕێنماییەکە دەقاودەق وەک خۆی ئەستەمە و لەڕووی کارگێڕییەوە هێندە ئاسان نییە، بەڵام گرنیگییەکەی لەوە دەردەکەوێت کە هەوڵی جدی هەیە بۆ کەمکردنەوەی بەریەککەوتنی دینداریی و دروستکردنی کەشێکی ناجۆر لەنێو مزگەوتەکان.

هەر لەگەڵ دەرچوونی ئەم ڕێنماییانە، یەکێتی زانایان لە ڕێگەی چەندین کۆڕ و کۆنفرانس و سیمپۆزیۆم، لە شوێنە جیاجیاکان، تەنانەت لەناو حەرەمی زانکۆکانیش، زەرورەتی پەیڕەوکردنی مەزهەبی شافیعی خستەبەرباس و خواس، بەمەش بۆ یەکەمجار بەکردەیی دوای ٣٠ ساڵ حوکمڕانی هەرێم، پەیڕەوکارانی مەزهەبی شافیعی و یەکێتی زانایان و وەزارەتی ئەوقاف بەفەرمی هەنگاویان نا بۆ سنوردارکردنی ئەو هەوڵانەی کە لەپێناو سڕینەوەی مەزهەبی شافیعی دەنران، لانیکەم بۆ یەکەمجار بوو بە فەرمی، لەسەر ئاستی وەزارەتێکی حکومەت، مەزهەبێک بە فەرمی و ئەوانیتر بە نافەرمی هەژماربکرێن.

ئەوەی جێی سەرنجی بەندەیە، پێویستە بە فەرمی و بە یاسایی مەزهەبێک وەک چەتری کۆکەرەوەی ئایینداران بناسێنرێت لە هەر وڵات و هەرێم و ناوچەیەک، گرنگ نیە ئەو مەزهەبە حەنەفی یان مالکی یان شافیعی یان حەنبەلی یان جەعفەری یان هەر مەزهەبێکی تر بێت، گرنگ ئەوەیە هزری ئایینداری نەشارەزا لە زانستە شەرعییەکان لە خەڵەتاندن و شێواندن و ئاڵۆزی بپارێزرێت، بەشێوەیەکی فەرمی و نیمچە فەرمیش لە وڵاتانی ئیسلامی ناساناندنی مەزهەبێکی دیاریکراو وەک مەزهەبی فەرمی هەیە، لە میسر شافیعی و لە جەزائیر و لیبیا و مەغریب مالکی و لە تورکیا و پاکستان و ئەفغانستان حەنەفی و لە سعودیە و بەشێکی وڵاتانی خەلیجی عەرەبی حەنبەلی و لە سەڵتەنەی عومان ئیبازی ... هتد.

ئەگەرچی ناساندنی مەزهەبێکی دیاریکراو لە ڕێگەی یاسا و ڕێنماییەکان لە وڵاتانی تری جیهانی ئیسلامی پاساو نیە کە لە کوردستانیش هەمان شت ئەنجامبدرێت، بەڵکو لە ئەرزی واقیع سەلمێنراوە فرەمەزهەبی یان لا مەزهەبیەت لە وڵاتێکی دیاریکراو یان لە هەرێمی دیاریکراو هێندەی زیانی هەیە سوودی نییە، بۆیە بەهەموو شێوەیەک پێویستە پاڵپشتی ئەو هەوڵانە بکرێت کە پرۆسەی ئایینداری ڕێکدەخەنەوە، یەکخستنەوەی پرۆسەی ئاینداریش بە هەبوونی خانەیەکی فەتوای بەهێز دەستپێدەکات، بەهێزی خانەی فەتواش بەوە دەبێت کە ڕەنگدانەوەی سەرجەم شەریحە ئایندارەکانی کۆمەڵگە بێت و شەرعیەتی یاسایی و فەرمی هەبێت.



پ.د. حسين محمد ئیبراهیم

# ئاسانكاری له‌ فه‌توادا

## شێخ قه‌ره‌زاوی* به‌نموونه‌

* شێخ قه‌ره‌زاوی ناوی یوسف عه‌بدوڵلا قه‌ره‌زاوییه‌، له‌ ساڵی ١٩٢٦ له‌ میسر له‌دایكبووه‌، پێش ته‌مه‌نی ١٠ ساڵی هه‌موو قورئانی پیرۆزی له‌به‌ركردووه‌، پاش خوێندنی ناوه‌ندی دواناوه‌ندی ئایینی په‌یوه‌ندی كردووه‌ به‌ كۆلیجی بنه‌ماكانی ئایین له‌ زانكۆی ئه‌زهه‌ر و پله‌ی یه‌كه‌می به‌ده‌ستهێناوه‌ له‌و كۆلێجه‌دا، بڕوانامه‌ی "العالمية" له‌گه‌ڵ ڕێگه‌پێدانی وانه‌وتنه‌وه‌ی به‌ده‌ستهێناوه‌ له‌ كۆلێجی زمانی عه‌ره‌بی له‌ ساڵی ١٩٥٤، له‌سه‌ر ئاستی هه‌رسێ كۆلێجه‌كه‌ی ئه‌زهه‌ر پله‌ی یه‌كه‌می به‌ده‌ستهێناوه‌. ساڵی ١٩٦٠ بڕوانامه‌ ماسته‌ر و ساڵی ١٩٧٣ بڕوانامه‌ی دكتۆرای به‌ده‌ستهێناوه‌ به‌ پله‌ی باڵا، ناونیشانی نامه‌ی دكتۆراكه‌ی "الزكاة وأثرها في حل المشاكل الإجتماعية"یه‌. ساڵی ١٩٦١ چووه‌ته‌ وڵاتی قه‌ته‌ر و كراوه‌ به‌ به‌ڕێوه‌به‌ری ناوه‌ندی په‌یمانگای ئایینی، له‌ دوای جێگیربوونی له‌و وڵاته‌ ناسنامه‌ی قه‌ته‌ری وه‌رگرتووه‌ و ساڵی ١٩٧٧ كۆلیجی شه‌ریعه‌و خوێندنی ئایینی دامه‌زراندووه‌ و هه‌تا كۆتایی ساڵی ١٩٩٠ ڕاگری ئه‌و كۆلێجه‌ بووه‌. خاوه‌نی ده‌یان كتێبی ناوازه‌یه‌ له‌ بواره‌كانی فقه‌ و شه‌ریعه‌ت و فه‌توا و فیكری ئیسلامی، نزیكه‌ی ٢٠ ساڵ به‌رنامه‌ی "الشريعة والحياة" به‌ میوانداری ئه‌و پێشكه‌شكراوه‌ له‌ كه‌ناڵی "الجزيرة"، كه‌ ناوبانگێكی زۆری له‌جیهانی ئیسلامیدا هه‌بوو. له‌ ئه‌یلوولی ٢٠٢٢ له‌ وڵاتی قه‌ته‌ر كۆچی دواییكرد. ئێستا كۆبه‌رهه‌مه‌كانی كۆكراونه‌ته‌وه‌ له‌ دووتوێی ١٠٤ به‌رگدا و به‌ چاپ گه‌یه‌نراوه‌. بڕوانه‌: يوسف القرضاوي فقيه الدعاة وداعية الفقهاء: عصام تليمة، دار القلم – دمشق، ط١،سنة ١٤٢٢هـ – ٢٠٠١م، ص١٢-٢٠، ؛ علماء ومفكرون عرفتهم: محمد مجذوب، دار الشواف، الرياض- المملكة العربية السعودية، ط٤، سنة:١٩٩٢م، ج١، ص٤٦٧.

**دەسپێک:**

فەتوادان وەک ئەرکێکی ئاینی کۆمەڵایەتی سەرشانی زانایانی ئیسلام، بریتییە لە: "وەڵامدانەوەی کەسێک کە پرسیار لە حوکمی شەرع دەکات سەبارەت بە کارێک یان مامەڵەیەکی خۆی، وەڵامدانەوەکەش لەڕێی بەڵگە شەرعییەکانەوە دەبێت یان لە ڕێی (ڕادۆزیی – إجتهاد)ەوە دەبێت، بێ ناچارکردن بە ڕای موفتییەکەوە"[1]

دیارە ئەم ئەرکە ئاینییە گرنگییەکی تایبەتی هەیە لە ژیانی مسوڵماناندا، تاکی مسوڵمان هەمیشە پێویستییەتی کە ڕای ئیسلام و شەرع بزانێت سەبارەت بە پێشهات و ڕووداوەکانی چواردەوری، کێشە شەرعی و کۆمەڵایەتییەکانی، هەڵوێست و مامەڵە دارایی سۆزداری و میرات و تەواوی لایەنەکانی ژیانی ئایینی و کۆمەڵایەتی و دەروونی خۆی. ئەوکەسەی کە بەئەرکی فەتوادان هەڵدەستێت چەندین مەرج ڕێنمایی هەن کە پێویستە ڕەچاویان بکات، ئەمانە لە کۆن و نوێشدا زانایان باسیان کردوون و پەڕاوو و نوسراوی تایبەتییان لەسەر داناون، لەوانە:

١. پێویستە موفتی عەدالەتی تێدا بێت، واتە کەسێکی دیندار بێت و گوناهی گەورەی لێنەبینرابێت و لەسەر گوناهی بچووکیش بەردەوام نەبێت. هەروەها کەسێکی دادپەروەر بێت بەشێوەیەک ناودار نەبێت بە لادان لە دەقە شەرعییەکان و مەحسوبیەت بۆ دەسەڵاتداران و کەسانی نزیک لە خۆی، پەلە نەکات لە فتواکانیدا و چاوقایم نەبێت لە دەرکردنی حوکمە شەرعییەکاندا، فەتوا بە قیل و قالەکان یان ڕایە نامۆ و نەشازەکان نەدات. ئەمانە هەموویان دەچنە ناو مەرجی عەدالەتەوە.

٢. پێویستە موفتی زانا بێت، بەشێوەیەک ئەو زانستانەی خوێندبێت کە بۆ کرداری فەتوادان پێویستن و بیانزانێت و بتوانێت شیکاری بکات تیایاندا و دایانبەزێنێتە سەر واقع. هەروەها زانیاری هەبێت لەسەر زانستە هاوچەرخەکانی مرۆڤایەتی یان لەکاتی فەتوادان سود لە کەسانی پسپۆڕی ئەو زانستانە وەربگرێت ئەگەر بابەتەکە پێویستی بەڕا وەرگرتنی ئەوان کرد.

٣. پێویستە موفتی مەرجی وریایی و ئاسۆ فراوانی و دووربینی تێدا بێت، ئەمەش زۆر گرنگە لە موفتیدا بەرجەستە بێت بەشێوەیەکی کرداری، چونکە تەنها زانایی ناتوانێت لە گرفت و کێشەکانی خەڵک تێبگات و چارەسەریان بکات و

١ صناعة الفتوى في القضايا المعاصرة- معالم وضوابط وتصحيحات : د. قطب الريسوني, دار ابن حزم، ط١,١٣٥هـ - ٢٠١٤م، ص٢٧




دەرچەیان بۆ بدۆزێتەوە. بۆیە کەسانی گێل و کورتبین بە کەڵکی فەتوادان نایەن.

هەمیشە ئەو زانایەی کە شان دەداتە بەر فەتوادان لەگەڵ ئەوەی کە پێویستە ئاستێکی زۆرباشی بڕیبێت لە زانستە شەرعییەکاندا و بتوانێت شیکردنەوە و خوێندنەوەیان بۆ بکات؛ لەهەمانکاتدا پێویستە کەسێکی ژیر و ورد بێت هەتا بەشێوەیەکی دروست بتوانێت دەقە شەرعییەکان دابەزێنێتە سەر واقع و دەرچەی فیقهی بۆ ئاریشەکان بدۆزێتەوە و بە ڕۆحی دەقەکان فەتوا لەسەر بابەتە نوێیەکان بدات.

٤. پێویستە موفتی خاوەنی لێهاتوویی گونجاندنی فیقهی بێت، توانای پێوانەکردنی پرسیارەکەی بە بابەتە دەقە لەسەرەکانەوە هەبێت، ئەمەش پێی دەوترێت (التكييف الفقهي)، ئەو لێهاتووییەش بەزۆری بە بەردوامی وردبوونەوە و ڕاهێنان دروست دەبێت.

٥. پێویستە بگەڕێت بە دوادەرچەی فیقیدا بۆ کێشە و پرسیارەکان -تا بگونجێت- لە سنووری شەرعدا ئاسانکاری بکات.

٦. پێویستە موفتی ئاشنا بێت بە مەبەستەکانی شەریعەت، بگەڕێ بەدوای ئامانجی حوکمە شەرعییەکاندا، لە فەتواکانیدا ڕەچاویان بکات، چونکە شەریعەت لە بنەڕەتدا بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەکان دانراوە، هەربۆیە نابێتە هۆی تێکدانی بەرژەوەندییەکانیان.

٧. ئاشنابوون بە واقع و کەتوار، ئەمەش مەرجێکی سەرەکییە بۆ فەتوادان، هەربۆیە پێویستە موفتی لە واقعی چواردەوری خۆی تێبگات و ئاشنا بێت بە کێشە و گرفتەکانی کۆمەڵگاکەی خۆی، ئەگەرنا فەتواکانی ناواقعی و کورت و کوێر و نادادپەروەرانە دەدەچێت...

چەندین مەرج و ڕێنمایی تر باس کراون لە کتێبە شەرعیی و ئەکادیمییەکاندا، ئەوەی باسمان کردن گرنگترینیانن[٢].

---

٢ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، هەروەها: موسوعة الاعمال الكاملة: الإمام يوسف القرضاوى، دار الشاميه، ط١، ١٤٤٤ه- ٢٠٢٢م، ج٤١ ص١٤ وما بعده، هەروەها بڕوانە: التيسير فى الفتوى أسبابه وضوابطه: تأليف عبد الرزاق بن عبد الله صالح بن غالب الكندى، مؤسسة الرسالة- ناشرون، ط١،١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨م، ص٢٩.

## باسی یەکەم: ئاسانکاری لە فەتواداندا، مەرج و هۆکارەکانی

### أ. مەبەست لە «ئاسانکاری»:

مەبەست لە «ئاسانکاری» لابردنی مەشەقەت و ئەزیەتە لەسەر کەسی پرسیارکەر بەشێوەیەک پێچەوانە نەوەستێتەوە لەگەڵ دەقەکاندا، ئەمەش بەڕەچاوکردنی زەمان و شوێن و کەس و حاڵەتەکان و دۆزینەوەی دەرچەی شەرعی دروست بۆیان، چونکە لە زۆرێک لە حاڵەتەکاندا فەتوا بۆ کەسی ناچار وەک کەسی ئاسایی نییە و بۆ بەهێز وەک لا واز نییە و بۆ دەوڵەمەند وەک فەقیر نییە و بۆئەوەی لە ترسدایە وەک ئەوەی لە ئەمان دایە نییە...

مەبەست لە «ئاسانکاری» ئەوە نیە کە موفتی بەبێ ڕەچاوکردنی دەقەکان چۆن ئاسان بوو بۆ کەسی پرسیارکەر بکەوێتە فەتوادان، هەربۆیە هەرگیز نابێت ئاسانکاری پێچەوانە بوستێتەوە لەگەڵ دەقەکان یان مەبەستە شەرعییەکان، یاخود دەستگرتن بە بۆچوونە لاوازەکانەوە لەبەرئەوەی ئاسانکارترن. هەروەها ئاسانکاری لە هەموو شتێک و حوکمێکی شەرعیدا نییە، بەڵکو هەندێک لە حوکمەکان قورسی و مەشەقەتەکەی ئاسان ناکرێت وەک جیهادی واجب.

بەڵام دەبێت ئەوە بزانین مەشەقەت و قورسی ئەرکەکان مەبەست نین لە یاسا شەرعییەکاندا وەک زانایانی بنەمانکانی فیقە -أصول الفقه- دەڵێن، بە دەربڕینێکی ڕوونتر شەریعەت مەبەستی قورسکردنی ئەرکەکان نییە، بەڵکو ئەو بابەتە هەر ڕەچاو ناکرێت لە ئەحکامدا، بەڵکو حیکمەت و ئامانجەکان شتی ترن، بۆیە نابێت قورسکردن بکرێتە ئامانج و حیکمەت و مەناطی حوکمە شەرعییەکان، بۆ نموونە ئەگەر کەسێک دەیتوانی هاتووچۆی دوو مزگەوت بکات یەکێکیان دوورتر بوو؛ بەڵام هەردووکیان لەڕووی عیبادەت و موافقەی شەرعەوە وەک یەک بوون، هەر لەبەرئەوەی خێری زۆرتر بگات -بەوەی کە زۆرتر هەنگاو بنێت بۆ مزگەوتە دوورەکە- خۆی تووشی مەشەقەتی زیاتر بکات ئەوە خێری ناگات و کارەکەی پێکاو نییە؛ چونکە مەشەقەت داواکراو نییە، کاتێک دوو کردەوە وەک یەک بوون کامیان ئاسانترە پێویستە ئەوەیان هەڵبژێردرێت[٣].

کەواتە مەبەستمان ئەوەیە کە پێویستە ئاسانکاری لەژێر سێبەری دەقە شەرعییەکاندا بکرێت، چەندە بکرێت ڕایە ئاسانەکان وەربگرین لە فەتوای زانایاندا

---

٣ بڕوانە: الوجيز في أصول الفقه: د. وهبه الزحيلي، دار الفكر – بيروت" ١٩٩٥م، ط٢، ص ١٥٠-١٥١

و له نێوان دوو بۆچووندا كه یەكێكیان قورسه و ئەوی تر ئاسانه، ئاسانەكه هەڵبژێرین هەتا بارگرانی كەمتر بكەینەوە، بەمەرجێك پێچەوان نەبێت و لەگەڵ بەڵگەكاندا بێتەوە، هەرئەمەشه سوننەتی پێغەمبەری خودایه (د.خ) ئەوەتا عائشه – ڕەزای خودای لەسەر بێت- دەفەرموویێت: (هەركات پێغەمبەر له نێوان دوو كاردا ئیختیار كرابێت ئاسانەكەیانی هەڵبژاردووە، بەمەرجێك تاوان نەبووبێت..)[٤].

هەروەها فەتوا بۆ دۆزینەوەی ڕێگه چارەی شەرعییە، زۆرجار ڕەنگه ئەو كەسەی كه پرسیارێكی شەرعی دەكات وەڵامه ڕووكەشیی و ڕاستەوخۆكەی لەلا هەبێت؛ بەڵام بۆیه پرسیار دەكات دەرچەیەكی فیقهی و ڕێگەیەكی ئاسان یان چارەسەرێكی گونجاوتری له كەسی موفتیەوە دەست بكەوێت، بۆئەوەی كارەكەی ڕایی بكات.

به كورتی دەتوانین بڵێین، كه «ئاسانكاری» هەموو كات ڕوانینه بۆ بەرژەوەندییه شەرعییه درووستەكانی تاك و كۆمەڵگه، كه پێچەوانه نەوەستێتەوە لەگەڵ دەق و ئامانجەكانی شەریعەت و بەپێی یاسا فقهییەكانی پەیوەست به مەشەقەتەوە ڕەچاو دەكرێت وەك یاسای فقهی «إذا ضاق الأمر اتسع» واته: ئەگەر ئاسۆی كردەوەیەك تەسكبوویەوە حوكمەكەی فراوانی تێدا دەكرێت، واته ئاسان دەكرێت، هەروەها ڕەچاوی ژیانی كۆمەڵگه و عورف و عادەتەكانیان ئەوەی پێوەی گیرۆدەبوون و له ڕەچاوكردنی بەشێك له فەتوا ڕاستەوخۆكاندا تووشی مەشەقەت دەبن و پێویستییان به دەرچەی فقهی هەیه بەبێ دژ وەستان لەگەڵ دەقەكان، ئەوەیه كه دەبێت موفتی ئاسانكار بێت تیایدا.

### ب. بەڵگەكانی ڕەچاوكردنی «ئاسانكاری»:

شەریعەت بۆخۆی لەسەر ئاسانكاریی و لابردنی مەشەقەت و عەزیەت بنیاتنراوە، ئەمەش له قورئان و فەرموودەكاندا له دەیان جێدا ئاماژەی پێكراوە، لەوانه:

– له كۆتایی باسی دەستنوێژگرتندا خوای گەورە دەفەرمووێت: (ما مايُريد اللهُ لِيَجعلَ عَلَيكُم مِن حَرجٍ ولكن يُريدُ لِيُطَهِركُم..)، واته: خودا نایەوێت ئێوه تووشی ئیحراجی و ناڕەحەتی بكات، بەڵكو دەیەوێت پاكتان بكاتەوە.

– له كۆتایی باسی ڕۆژوودا دەفەرمووێت (يُريدُ اللهُ بِكُمُ اليُسرَ ولا يُريدُ بِكُمُ العُسْرَ)، واته: خودا ئاسانكاری دەوێت بۆ ئێوه و نایەوێت تووشی ئەركی قورستان بكات.

– له كۆتایی سورەتی حەجدا دەفەرمووێت (**هُوَاجْتباكُم وما جَعَلَ علَيكُم في الدِّين مِنْ حَرَج**)،

---

٤ ئەم فەرموودەیه ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی كردووه بەژماره (٦٧٨٦).

ئەو ئێوەی هەڵبژردووە و لە ئاییندا شتی ئیحراجی و نارەحەتی بۆ تەشریع نەکردوون.

- پێغەمبەری خودا (د.خ) دەفەرموویێت: (ئاسانکار بن کارەکان قورس مەکەن، مژدەدەر بن بێزارکەر و نامۆ مەبن)[٥]

- لە شوێنێکی تردا دەفەرموویێت(ئێوە بە ئاسانکاریی و مژدەدەری نێردراون بۆ گەلان، نەک بە بارگرانگەر قورسکەر)[٦]

- تەنانەت دەیان فەرموودەمان هەیە کە پێغەمبەری ئیسلام ڕەخنەی توندی لەو کەسانەگرتووە کە توندڕەی دەکەن لە جێبەجێکردنی عیبادەتەکانیاندا, لە هەندێکیاندا ئاماژە بەوە دەدات کە ئەم کردەوەیە پشتهەڵکردنە لە سوننەتی من، «ئەوەش پشت هەڵبکات لە سوننەتی من لە من نییە»[٧]...

لەم دەقانە و چەندین دەقی تردا ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ جەخت لە ئاسانکاری کراوەتەوە، هەربۆیە زانایانی زانستی مەبەستەکانی شەریعەت- مقاصد الشريعة «ئاسانکاری» بە یەکێک لە مەبەستە گشتگیرە قەتعییە بەرزەکان دادەنێن. دەفەرموون دەقەکانی «ئاسانکاری» گەیشتوونە سنووری «تەواتر» و بوونەتە بابەتێکی قەتعی گشتگیر کە لە هەموو کایەکانی شەریعەتدا ڕەچاوکراوە و خەڵکی لەسەر هاندراوە[٨].

### ت. مەرج و بنەماکانی ڕەچاوکردنی «ئاسانکاری»:

وەک ئاماژەمان پێدا ڕەچاوکردنی ئاسانکاری بێ مەرج و ڕێنمایی نییە، موفتی نابێت بێ ڕەچاوکردنی بنەماکان فەتوای ئاسانکاری بدات لە حوکمە شەرعییەکاندا، زانایانی کۆن و هاوچەرخ هەندێک مەرجیان دیاری کردووە بۆ ئاسانکاری کردن، ئەمانە گرنگترینیانن:

١. ئاسانکاری دەبێت بەقەدەر خۆی بێت و زیاتر نەبێت لە پێویستی، واتە ئەگەر بۆ لابردنی مەشەقەتێک بوو ئەوە دەبێت بەقەدەر خۆی بێت و زیاتر نەبێت لە پێویستی، ئەمەش بەرمەبنای ئەو یاسا فقهیە دانراوە کە دەڵێت «الضرورة تقدر بقدرها» واتە

---

٥ ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە، ژمارە (٦٩)، هەروەها ئیمامی موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە، ژمارە (١٧٣٤).

٦ ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە، ژمارە (٢٢٠).

٧ ئیمامی بوخاری ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە، ژمارە (٥٠٦٣).

٨ بڕوانە: مقاصد الشريعة الإسلامية: محمد الطاهر بن عاشور، دار النفائس- الأردن، ط٣، ١٤٣٢هـ - ٢٠١١م، ص٢٣٥-٢٣٦.

زەرورەت و پێویستی کە ئاسانکاری تێدا کرا دەبێت بەقەدەر خۆی بێت، کەواتە کە حەرامێک حەڵاڵ کرا لەبەر زەرورەت –واتە ئاسانکرا – ئەوە دەبێت بەقەدەر خۆی بێت و کە هۆکارەکەشی نەما ئەوە دەچێتەوە جێگەی خۆی و حەرام دەبێتەوە.

٢. دەبێت ئاسانکاری لەبەر هۆکارێکی پێویست بێت، نەک لەسەر هەوا و ئارەزوو بێت یاخود هەر مەبەست خودی «ئاسانکاری» بێت، بەبێ بەڵگە و هۆکاری پێویست.

٣. ئاسانکاری نابێت بەرمەبنای خیلافە فقهییەکان بێت، واتە ئەگەر لە مەسەلەکەدا دوو ڕا یان زیاتر هەبوو یەکێکیان لە هەموویان ئاسانتر بوو، بەڵام بەڵگەکانی لاوازبوون نابێت دەستبەوەیانەوە بگرین و بەڵگە بەهێزەکان پشتگوێ بخەین.

٤. نابێت ئاسانکاری بکرێت بۆ حەڵاڵکردنی حەرامێکی چەسپاو تەنها لەبەر ناچاری نەبێت بۆ کەسی ناچار و لەبەر بەرژەوەندییەکی باڵا.

٥. ئاسانکاری لە فەتوادا مەرج نییە گشتگیر بکرێت، واتە بۆ هەموو کەس ئەو حوکمە بدرێت و ئاسان بکرێت، چونکە فەتوا بەپێی کەس و شوێن و کات دەگۆڕێت.

٦. ئاسانکاری گشتی تەنها لە بابەتی بەڵای گشتیدا- عموم البلوی- دا دەبێت، کاتێک کە کێشەیەک کە پێویستی بەفەتوایە هەموو کۆمەڵگە بگرێتەوە و خۆپارێزی لێنەکرێت.

٧. بەشێوەیەکی گشتی ئاسانکاری گشتی لەو شتانەدا ناکرێت کە بۆخۆیان مەشەقەتیان زیاتر تێدایە و مسوڵمانان ناچارکراون کە ڕەچاوی بکەن وەک جیهاد و تێکۆشان لەپێناوی خودا، چونکە ئەمە بەرژەوەندی زیاترە بۆ کۆمەڵگە.

٨. فەتوا لەبەر هەواو ئارەزووی ئاسانکاری ناگۆڕدرێت، بەڵکو کاتێک دەگۆڕێت کە هۆکار و عیللەتی حوکمەکەی گۆڕا بەڕەچاوکردنی ڕێنماییەکانی فەتوادان.

٩. بۆ هەموو کەس نییە ئاسانکاری لە فەتوادا بکات؛ بەڵکو بۆ ئەوانەیە کە زانای ژیر و لێهاتوون و بەڵگە و واقع دەزانن و مەرجەکانی فەتوادانیان تێدایە.

١٠. نابێت ئاسانکاری لە فەتوادا ببێتە هۆی زیانگەیاندن بە هیچ کەس و لایەنێک، یان زیان بە ئابووریی و کایەکانی تری کۆمەڵگە بگەیەنێت.

.. ئەمانە و چەندین ڕێنمایی و مەرجی تر باس دەکرێن، کە ڕەچاوکردنیان جوانی شەریعەت و واقعی بوونی دەسەلمێنێت، هەروەها کەسی لێهاتوو لە شەریعەت و واقع و خاوەن ژیری دەتوانێت ڕەچاوی ئاسانکاری بکات پێیان.

## باسی دووەم:
## میتۆدی شێخ قەرەزاوی لە فەتوادا و ڕەچاوکردنی «ئاسانکاری»

شێخ قەرەزاوی وەک زانایەکی هاوچەرخی لێهاتوو خاوەنی ئاسۆیەکی فراوان لە زانست و مەعریفەت، ئەکتیف لەگەڵ ڕاگەیاندن و سیاسەت و کایەکانی کۆمەڵگە، خاوەنی سەدان فەتوای هاوچەرخ و پەڕاوی تایبەت بە فەتوا و میتۆدەکانی؛ هەر لەزووەوە هەستی بە پێویستی دانانی میتۆد سەبارەت بە فەتوا هاوچەرخەکان کردووە، هەربۆیە لە کتێبەکانیدا ئەو میتۆدانەی داڕشتووە کە بۆ خۆی لە فەتواکانیدا پیادەیان دەکات. چوار کتێبی دانراوی هەیە سەبارەت بە فەتوادان و میتۆدەکانی، ئەمە جگە لە بۆچوونەکانی سەبارەت بە میتۆدی بنەماکانی فیقە و مەبەستەکانی شەریعەت و یاسا فقهییەکان.. کە بۆچوونی تایبەتی خۆی لەمەڕ هەندێک لە بابەتەکانییەوە هەیە، هەروەها بێجگە لە دەیان بەرگ لە کۆکراوەی فەتواکانی..، چوارکتێبەکشی لەم بوارەدا:

- فتاوى معاصرة، لە سەرەتاکەیدا بەباتێکی دورو درێژ ئەم بابەتە دەوروژێنێت.
- الفتوى بين الانضباط والتسيب.
- موجبات تغير الفتوى.
- الفتاوى الشاذة معاييرها وتطبيقاتها وأسبابها وكيف نعالجها.

لەم کتێبانەدا بەشێوەیەکی زۆرجوان و بەنموونە و بەڵگەوە باس لە میتۆدەکانی فەتوادان دەکات و ئەو هەڵە و کەمووکوڕییانە باس دەکات کە لە فەتواکاندا هەن، بەمیتۆدە جوانە زانستییەکەی خۆی ڕێنمایی جوان و شایستە دەدات بە خوێنەران و موفتییەکان بۆ فەتوادانێکی دروست لەم چەرخەدا.

ئەوەی من مەبەستمە باسی «ئاسانکاری»یە لە فەتواداندا، کە لە زۆرێک لە کتێبەکانی تریشیدا جەختی لەسەر دەکاتەوە.

لە سەرەتای کتێبی «فتاوى معاصرة»دا بابەتێکی دوورودرێژی تەرخانکردووە بۆ میتۆی فەتوا لەلای خۆی، بەناونیشانی «نهجي في الإفتاء»، کە بە نموونەوە لە شەش خاڵدا باسی ئەو شتانەی کردووە کە لە فەتواداندا ڕەچاویان دەکات، بەکورتی ئەمانەن:

١. نابێت لە فەتوادا دەمارگیریی و تەقلیدمان هەبێت.
٢. ئاسانکار بین نەک بارگرانکەر.
٣. پێویستە بە زمانی سەردەم لەگەڵ خەڵک بدوێین.

٤. پشتکردنە ئەو شتانەی کە سوود بە خەڵک ناگەیەنن.

٥. میانڕەوی لە نێوان ئەوانەی هەموو شت حەڵاڵ دەکەن و ئەوانەی کە حەزیان بە قورسکردنە و هەموو شت حەرام دەکەن.

٦. حەقدان بە فەتوا بەوەی ڕوونکردنەوە و ڕاڤەی تەواوی بۆ بکرێت.

بۆ هەریەک لەم خاڵانە چەندین سەرنجی جوانی بە نموونەوە خستووەتە ڕوو.

لە درێژەی خاڵی دووەمدا دەڵێت: «پێویستە ڕوحی ئاسانکاری لە فەتوادا زاڵ بکەین بەسەر ڕوحی توندی و قورسکردن، ئەویش لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: شەریعەت لەسەر ئاسانکاری بنیاتنراوە، ئەمەش قورئان دەقی لەسەر داوە و بە ڕاستەوخۆش فەرموودەکان جەختیان لەسەر کردووەتەوە. پاشان هەموو ئەو دەقانە دەهێنێت کە بەڵگەن لەسەر ئاسانکاری[٩]، بۆ هۆکاری دووەم دەڵێت: «دووەم: سروشتی ئەم سەردەمەی ئەمڕۆ؛ دەبینین ماددییەت زاڵ بووە بەسەر ڕۆحانیەتدا و سودگەرایی بەسەر ئەخلاقدا، دەبینین چۆن دینداری لاواز بووە و تەوژمە بێدینییەکان لەلای ڕاست و چەپ و سەرو خوار و پێش و دواوە هێرشیان هێناوە و دەیانەوێت دینداری لە ڕەگەوە هەڵبکەنن لە کۆمەڵگاکاندا، بەشێوەیەک نەیهێڵن کە نەیەتەوە مەیدان. لەڕاستیدا ئەمانە چەندین بزاڤن کە هێزە گەورەکان بە دارایی و پلان و ڕێنماییکردن یارمەتیان دەدەن، هەر ئەوان ڕێگەی شوێنکەوتنی ئارەزووەکان و پلەو پایەکانیان بۆ ئاسان دەکەن.

تاکی مسوڵمانیش لەم کۆمەڵگایانەدا لە میحنەتێکی توندا دەژی؛ بەڵکو لە شەڕێکی بەردەوامدایە و هاوکار و دەستباری کەمە، بەپێچەوانەوە ڕێگر و لەمپەری زۆری هەیە، هەربۆیە پێویستە ئەهلی فەتوا ئاسانکاری بکەن چەندە بتوانن و لایەنی ڕووخسەت زاڵبکەن بەسەر لایەنی عەزیمەت و توندیدا، بۆئەوەی خەڵک لە ئایین نزیکبێتەوە و دەستی پێوە بگرێت نەک لێی ڕابکات، هەربۆیە ئیمامی سەوری – ڕەحمەتی خودای لەسەر بێت– دەفەرموویت: (إنما العلم الرخصة من ثقه، أما التشديد فيحسنه كل أحد) واتە: زانست ئەوەیە بتوانرێت ئاسانکارییەک بدۆزیتەوە، چونکە توند کردن و قورسکردنی کارەکان –هونەری تیدا نییە– ئەوە شتێکە هەموو کەس دەیزانێت..[١٠]» پاشان ئاماژە بە هەندێ هەڵویست و قسەی زانایان دەدات سەبارەت بە « ئاسانکاری».

---

٩ لەباسەکانی سەرەوەدا ئاماژەمان بەزۆربەی ئەو دەقانەدا، بۆیە بەپێویستم نەزانی دووبارەی بکەمەوە.

١٠ سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٦–١٩ بەکورتکراوەیی.

پاشان دەنوسێت: «ئێمە لەم سەردەمەدا لە هەموو کەس زیاتر پێویستیمان بە فراوانکاری هەیە لەسەر خەڵک، من بۆخۆم ئەوەم هەڵبژاردووە کە لە شتە لاوەکیی و فەرعییەکاندا ئاسانکاری بکەم بۆ خەڵک و توندبم لە شتە بنەمایی و جەوهەرییەکاندا، مەبستیشم ئەوە نییە کە پشتبکەمە دەقەکان بۆئەوەی ڕایەکی ئاسان تەرجیح بدەم یان ملی دەقەکان با بدەم .. نەخێر ئەو ئاسانکارییەی کە من مەبەستمە ئەوەیە کە پێچەوانە ناوەستێت لەگەڵ دەقێکی چەسپاوی ڕوون یان لەگەڵ یاسایەکی شەرعی قەتعی؛ بەڵکو مەبەستم ئەو ئاسانکارییەیە کە لەگەڵ بەڵگە و یاساکان دێتەوە.

**ئاسانکاری هەموو کات ڕوانینە بۆ بەرژەوەندییە شەرعییە درووستەکانی تاك و کۆمەڵگە، کە پێچەوانە نەوەستێتەوە لەگەڵ دەق و ئامانجەکانی شەریعەت.**

میتۆدی من هەموو کاتێک شوێنکەتنی بەڵگەکان بووە، هەربۆیە هیچکات قازانجی سووەکانم حەڵاڵ نەکردووە، چونکە بەڵگەکانی ڕوون و قەتعین.. هەروەها جگەرەخواردنم حەڵاڵ نەکردووە –ئەگەرچی بووە بە بەڵایەکی گشتی و خەڵکی زۆر پێوەی گیرۆدەبوون– چونکە بەڵگەکانی شەرع ڕەتیدەکەنەوە.. بەڵام ڕای شیخو لئیسلام ئیبن تەیمیە و قوتابیەکانم هەڵبژاردووە لە بابەتی تەڵاقدا، چونکە هەستم کردووە کە ڕەنگەدانەوەی ڕۆحی ئیسلام و مەبەستەکانی شەریعەتە و لەگەڵ دەقەکاندا گونجاوە

بەگشتی ئەگەر دوو ڕا هەبن بەڵگەکانیان هاوشانی یەک بن یەکێکیان ئیحتیات و خۆپارێزی تێدا بێت و ئەوی تریان ئاسانتر بێت ئەوکات من فەتوا بە ئاسانەکە دەدەم، ئەوەش وەک چاوکردن لە پێغەمبەری خودا کە هەرکات ئیختیار کرابێت لە نێوان دوو شتدا ئاسانەکەیانی هەڵبژاردووە ئەگەر تاوان نەبووبێت، بەڵام ئەو ڕایەی کە ئیحتیات و خۆپارێزی تێدایە دەکرێت موفتییەکە بۆ ژیانی خۆی ئەو ڕایە

هەڵبژێریت، یان بۆ ئەو کەسانە بەکاری بهێنێت کە ئەهلی عەزیمەتن و ئەهلی وەرع و ئیحتیاتن، بە مەرجێک سەرنەکێشێت بۆ توندڕەوی»[١١].

لەم دەقانەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە شێخ قەرەزاوی زۆر قوڵ و وردەکار و زانایانە دەست بە ئاسانکارییەوە دەگرێت و دەیەوێت لە شوێنی خۆیدا بەکاری بهێنێت. هەروەها لە کتێبی «الفتوى بين الانضباط والتسيب»یشدا هەمان ئەو خاڵانەی پێشوو بە وردەکاریی و نموونەی جوان دووبارە دەکاتەوە، زۆر بە جوانی وەڵامی ئەو شلگیرانە دەداتەوە کە ئاسانکاریی و شلگیرییان لێ بووە بەیەک، هەروەها خاڵ بەخاڵ باسی ئەو پێهەڵخلیسکانانە دەکات کە موفتییەکانی ئەمڕۆ تێیکەوتوون و نموونەی زیندوویان بۆ دەهێنێتەوە.

هەروەها کتێبی «موجبات تغير الفتوى» کە کتێبێکی زۆر ناوازەیە و باس لەو هۆکارانە دەکات کە دەبنە هۆی گۆڕینی فەتوای باو لەسەر بابەتەکان، تیایدا بەنموونەوە ١٠ خاڵ باس دەکات کە دەبنە هۆی گۆڕینی فەتوا، ئەوانیش: «گۆڕانی شوێنی فەتوا، گۆڕانی زەمانی فەتوا، گۆڕانی حاڵی ئەو کەسەی فەتوای بۆ دراوە، گۆڕانی عورفی ئەو فەتوایەی دراوە، گۆڕانی زانیارییەکانی پەیوەست بەفەتوا پێشووەکان، گۆڕانی پێداویستی خەڵک، گۆڕانی توانا و دەسەڵاتی خەڵک، بەڵاداربوونی گشتی- عموم البلوى، گۆڕانی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری خەڵک، گۆڕانی ڕا و بۆچوونی و هزر».

ئەگەر باسی «بەڵاداربوونی گشتی -عموم البلوى » وەربگرین بە نموونە شێخ قەرزاوی لە ناوەڕۆکی ئەم سەرەباسەدا باس لەوە دەکات کە زانایان بەڵاداربوونی گشتی – عموم البلوى یان بە یەکێک لە هۆکاری ئاسانکاری داناوە، چونکە گیرۆدەبوونی کۆمەڵگە بەشتێکەوە کە خۆپارێزی لێی زەحمەت بێت بەڵگەیە کە کۆمەڵگە پێویستی بەو شتەیە، شەریعەتیش ڕەچاوی پێداویستییەکانی خەڵک دەکات، زانایان دەفەرموون «پێداویستییەکان حیسابی کارە زەرورییەکانیان بۆ دەکرێت- الحاجة تنزل منزلة الضرورة»، بۆ ئەم بابەتەش چەند نموونەیەک دەهێنێتەوە لەوانە باس لەسەر ڕووتی دەکات و دەفەرمووێ: زانایانی کۆن هەندێکیان ئەم کارەیان بە لەکەدارکردنی پیاوەتی داناوە بەڵام زانایانی ئەندەلوس بەئاساییان داناوە، هەروەها ڕیش تاشین هەندێ لە زانایان بەواجبی دەزانن و تاشینی بە حەرام

---

[١١] بڕوانە: موسوعة الاعمال الكاملة: الإمام يوسف القرضاوي، ج٤١ ص١٤ دواتر – بەکورتکردنەوەوە-

دەزانن، هەندێکی تر دەفەرموون سوننەتە، ئێستا زۆربەی ئومەتی ئیسلامی سەری ڕووت دەکات و ڕیشی دەتاشێت ناکرێت، بڵێین ئەوەی سەر ڕووت بکات و ڕیش بتاشێت شایەتی وەرناگیرێت، پێویستە لەم سەردەمەدا ئاسانکاری بکەین، هەروەها هەبوونی تەلەفزیۆن و سەیرکردنی، کە ئەو هەموو وێنانە نیشان دەدات، هەندێک بە حەرامی دەزانن بەڕەچاوکردنی ئەوەی ڕەسم و ئەوەی پەیوەستە پێوەی حەرامە، بەڵام لەڕاستیدا زۆر نامەعقولە لەم سەردەمەدا خەڵکانێک هەبێت سەیری تەلەفزیۆن نەکات بەیەکجاری.. ڕاستە دەکرێ خۆت بپارێزی لە شتە نا مەشرووعەکانی ناوی، یان کارکردنی ئافرەتان لە بوارە جیاجیاکاندا، ئەمەش بابەتێکی گشتییە و خۆپارێزی لێناکرێت لە هەموو پسپۆڕییەکاندا بەشدارن لەگەڵ پیاواندا، ناکرێت بڵێین ئیشکردنی ئافرەتان حەرامە، دەبێت لەم مەسەلانەدا ئاسانکاری بکرێت و ڕێکبخرێت بە ڕێنمایی شەرعی، چونکە ناکرێت لە ماڵەوە سجنیان بکەین بە بەهانەی بڵاوبوونەوەی فیتنە کە هەندێکیان دەتوانن زۆر سەرکەتووبن و بەشداری باش بن لە بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگە، تەنانەت هەندێکیان سەرکەوتووترن لە پیاوانیش، هەندێکیشیان کەس نییە بەخێویان بکات و پێویستیان بەکارکردن هەیە، هەر لە کۆنیشەوە ئافرەت کاری کردووە بۆ جێبەجێکردنی پێداویستی خێزانەکەی، وەک چیرۆکی کچەکانی شوعەیب کە باوکیان پیاوێکی بەتەمەن بوو، کچەکانی کاریان دەکرد، تەنانەت کۆمەڵگە پێویستی بەهەندێ ئیش هەیە کە لە بنەڕەتدا پسپۆڕی ئافرەتانە دەبێت ئافرەتان بیکەن نەک پیاوان وەک دکتۆری ئافرەتان و پەرستاران، تەنانەت هەندێ خێزان بۆئەوەی بژین پێویستیان بەوەیە کە ژن و پیاو بەیەکەوە کار بکەن. نابێت لەم سەردەمەدا جەخت لەو قسەیە بکەینەوە کە دەڵێت: ئافرەت بۆ ماڵەوە کراوە، ئەوێ مەملەکەتی ئەوە، سەردەمەکە وای لە ئافرەت کردووە بێتە دەرەوە و کار بکات. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوە بزانین کە بە (عموم البلوی) هەرگیز ئەو حەرامانەی کە قەتعین حەلاڵ نابن، ئەگەر هەموو خەڵکیش تێی کەوتبن و ئەنجامی بدەن..[١٢]

لەڕاستیدا لە ڕەچاوکردنی هەموو ئەمانە لە فەتوادا فەتواکە واقعی گونجاو و ئاسان دەکەن بۆ کەسی پرسیارکەر، بەپێچەوانەوە ڕەچاونەکردنی هەریەکێک لەم دە خاڵە دەبێتە هۆی دەرکردنی فەتوایەکی قورس و نەگونجاو لەگەڵ فیترەت و کۆمەڵگەدا.

هەروەها لە کتێبەکەی بە ناونیشانی «الفتاوی الشاذة» بە هەمان شێوە ١٠ هۆکاری

---

١٢ بڕوانە: موجبات تغير الفتوى : د. يوسف القرضاوي، ص ٩٣-٩٥

سەرەکی هێناوە بۆ فەتوا نەشاز و نەگونجاوەکان، هەموویان بە نموونەی زیندوو و بە درێژی هەڵوێستەی لەسەر کردوون» ئەوانیش: «دەرچوونی فەتوا لە کەسی نا ئەهلەوە، دەرچوونی فەتوای نابەجێ، پێچەوانە وەستانی فەتوا لەگەڵ دەقێکی قورئانی، پێچەوانە وەستانی فەتوا لەگەڵ دەقێکی فەرموودە، پێچەوانە وەستانی فەتوا لەگەڵ قیاسێکی ڕوون، پێچەوانە وەستانی فەتوا لەگەڵ مەبەستەکانی شەریعەت، وێنای هەڵە و نادرووست بۆ ئەو واقعەی پرسیاری لێوەکراوە، بەڵگە هێنانەوەی موفتی بەوشتانەی نابنە بەڵگە، ڕەچاو نەکردنی موفتی بۆ زەمان و شوێن و حاڵەتی کەسەکان».

لە بەشێکی تری کتێبەکەیدا باسی ئەو شتانە دەکات کە هەرگیز بە فەتوادانی نەشاز دانانرێت، لەوانە فەتوادان بە مەزهەبەکەی خۆت، دەرچوون لە کۆدەنگی هەرچوار مەزهەبەکە، دەرچوون لە ڕای زۆربەی زانایان- جمهور.. پاشان باس هۆکارەکانی درووستبوونی نەشازی لە فەتوادا دەکات و لەوانە باس لە ناپسپۆڕی دەکات و ڕێز نەگرتنی پسپۆڕییەکان و پەلەکردن لە فەتوادا و خۆپەسەندی لە فەتوادا و شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووی سیاسەت و ڕۆچوون لە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییەکان .. نموونەش بە گواستنەوەی نوێژی هەینی دەکات لە ئەمریکا بۆ ڕۆژی یەکشەممان کە هەندێ کەس باسیان لێوە کردووە و گفتوگویان لەسەرکردووە بەپێویستیان زانیوە ئاسانکاری تێدا بکرێت..

بەگشتی ئەم کتێبە زۆرجوان مەبەستی خۆی ڕووندەکاتەوە لە «ئاسانکاری»، هەم بەڕاستەوخۆ هەم بە ناڕاستەوخۆ کە دەتوانین بڵێین قەرەزاوی ڕاستە ئاسانکاری دەکات، بەڵام ئاسانکارییەکانی پشتئەستورە بە بەڵگەی زانستی و زانایانە ئەم هەنگاوە هەڵدەگرێت، ئەم دەرگایە بەکراوەیی جێناهێڵێت.

**لە کۆتاییدا** بۆمان ڕوون دەبێتەوە، شێخ قەرەزاوی یەکێکە لەو زانا هاوچەرخانەی کە کار دەکات بۆ «ئاسانکاری» لە فەتوادانداا، ئەمەش لە فەتواکانیدا ڕەنگیداوەتەوە، ئەگەرچی هەندێک لە فەتواکانی جێگەی ڕەخنەی هەندێ زانا و ناوەندە شەرعییەکانە، بەڵام هیچ کات فەتواکانی لە بەڵگەی شەرعی دەرناچن و بەشێوەیەکی زانستی بەڵگە بۆ ئەو ئاسانکارییانەی دەهێنێتەوە، میتۆدەکانی لە فەتوادا لە چوارچێوەی بەڵگە و یاسا شەرعییەکاندایە و تیایاندا ڕەچاوی سەردەم و کەتواری کردووە.

فەتوا لە سەردەمی ئێستادا لە هەر کاتێکی تر زۆرتر ڕووبەڕووی کێشە دەبێتەوە، لە گرنگترینی ئەو کێشانە ئەمانەن:

**یەکەم**: زۆری ڕووداو و پێشهاتە نوێیەکان، لە بەرانبەردا ناتوانایی بەشێک لە موفتییەکان لەڕووی تێگەیشتن و دەرککردنی پرس و بابەتەکان بەشێوەیەکی دروست و تەواو، لەگەڵ ئەوەشدا فەتوای لەبارەوە دەدەن.

**دووەم**: پەڕگیری یان شلگیری بەشێک لە موفتییەکان و دوورییان لە قورئان و سوننەتەوە، بەهۆی نەزانی و ناتێگەیشتنیان لە دەقەکان لەڕووی مەبەستگەراییەوە.

**سێیەم**: بوونی چەندین فەتوای نامۆ و پاڵپشتی نەکراو بە بەڵگەی باوەڕپێکراو.

**چوارەم**: تاکڕەویی و دەستپێشخەری لە فەتوادانیدا بەشێوەی تاکەکەسی لەو پرسانەدا کە پەیوەندیدارن بە کۆمەڵگەوە و ڕەهەندێکی گشتییان هەیە، ئەوەش وادەکات چەندین فەتوایی ڕووبدات و بەریەککەوتنی فەتوا بێتە ئاراوە، یان نەتوانێت لەڕووی ئەو شاڵاوەدا بوەستێت و لاواز بکەوێتە بەرچاو.

**پێنجەم**: دەرکردنی چەندین فەتوای پێچەوانە لەگەڵ ڕۆحی شەریعەت و بنەماکانی بیروباوەڕ و بەها باڵاکان بەشێوەیەک لەگەڵ هیچ دەقێکی جێگیری شەرعیدا هاوتەریب نییە.

**شەشەم**: خۆهەڵقورتاندن لە کاری فەتوا لەلایەن کەسانێکەوە کە ئەدەب و زانین و مەرجی فەتوادانیان تێدا نییە.

**حەوتەم**: جورئەت بەخۆدانی کەسانێکی نا ئەهل لەڕووی فەتوای شەرعییەوە بەرانبەر فەتوای زانایانێکی خوداناس و فەتوا دەستەجەمعییەکان و دروستکردنی گومان و دوودڵی لە بەرانبەریانەوە.

**هەشتەم**: بەریەککەوتنی هەندێک فەتوا لە پرسە هاوشێوەکاندا، ئەوەش دەبێتە مایەی دوودڵی و گومان لە لای خەڵکە گشتییەکە.

**نۆیەم**: درێژدادڕی هەندێک موفتی لە جیاوازی بۆچوونەکاندا، بەبێ خستنەڕووی ڕا و سەرنجی بەهێز و یەکلاکەرەوە.

**کێشە و گرفتی فەتوا لە سەردەمی ئێستادا**

کێشە و گرفتی فەتوا لە سەردەمی ئێستادا زۆرن، ئەمانە گرنگترینیانن:

١- نەشارەزایی تەواو بە ڕووداو و پێشهاتەکە و تێنەگەیشتن لێی بەشێوەیەکی دروست.

٢ – نزمی ئاستی زانست و ناتوانایی لە هەڵێنجاندن و ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی دەق و ئاماژەکانی.

٣- کەمی کەسی بە توانا و لێهاتوو خاوەن بەهرە لە بواری فەتوادا، بەشێوەیەک کە ئادابی فەتوا و مەرج و سیفاتە بنەڕەتییەکانی تێدا بێت.

٤ – بەهانە هێنانەوە بۆ پارێزگاریکردن لە پێگە و بەرژەوەندی و لەبەرچاوگرتنی خواستە کەسییەکانی خۆی.

٥ – بانگەشەی نوێگەرایی و سەردەمی بوون بە ڕەهایی و بەبێ هیچ کۆت و بەندێک.

٦ – میوانداریکردنی هەندێک لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بۆ وەرگرتنی فەتوا لە کەسانێک کە شایستە نین لەو بوارەدا.

٧ – لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی و حەز و ناو و ناوبانگ، یان لە خودا نەترسان و بێ باکی لە لۆمەی خەڵک.

٨ – هەڵە تێگەیشتن لە چەمکی ئاسانکاری (التیسیر) لە ئیسلامدا.

٩ – بێ ئاگایی و تێنەگەیشتنی هەندێک لە موفتییەکان لە فیقهی واقیع و سەرەنجامەکان و لەبەرچاونەگرتنی مەترسی و سەرەنجامی خراپی ئەو فەتوایانە.

جێکەوتەی خراپی فەتوا لە سەردەمی ئێستادا

بەهۆی ئەو کێشە و کۆسپ و لەمپەرانەی ڕووبەڕووی فەتوا دەبنەوە لەم سەردەمەی ئێستاماندا، ئەم جێکەوتە خراپانەی لێ ڕوودەوە:

أ – حەڵاڵکردنی حەرام و حەرامکردنی حەڵاڵ، ئەمەش تاوانێکی گەورەیە، بەڵکو هەندێکجار خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام دەکاتە دەرەوە.

ب – برەودان بە کافرکردنی خەڵک لەسەر تاوانکردن و ڕەوایەتیدان بە ڕشتنی خوێنی موسڵمانان.

ج – شێواندنی وێنای ئیسلام و تۆقاندنی خەڵک بە ئیسلام.

د – سەرهەڵدانی جودایی و پەرتەوازەیی لە نێوان موسوڵمانانداو دابەشبوونیان بۆ چەندین پێڕ و تاقم.

هـ – دروستکردنی پشێویی و پەرتەوازەیی و سەرقاڵکردنی خەڵک بە شتی لاوەکی و بچووکەوە و لەبیربردنەوەی پرسە گرنگ و ستراتیژییەکانی کۆمەڵگە و ئوممەتی ئیسلامی.

و – دروستکردنی گومان و دوودڵی لە نێوان خەڵک و فەرمانڕەوادا.

ز – بێمتمانەکردنی ناوەندی فەتوای باوەڕپێکراو و دروستکردنی بێمتمانەیی پێیان لەلایەن بەشێک لە خەڵکەوە.

ح – تانەدان لە زانایانی پەیامدار و تاوانبارکردنیان بە چەقبەستوویی و توندگیری لە فەتوادا.

ط – کەوتنە داوی فڕوفێڵی حەرامکراو و پشتبەستن بە بۆچوونی نامۆ و گرتنەبەری ڕێگای گوڵبژێری بۆچوونە لاوازەکان، بە پاڵنەری حەز و ئارەزوو، بۆ ڕازیکردنی هەندێک خەڵک.

### چارەسەر و کۆت و بەندەکان:

بۆئەوەی فەتوا سەنگ و قورسایی پارێزراوبێت و جێکەوتەی باشی هەبێت لەسەر کۆمەڵگە، دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

**یەکەم**: ڕێز و حورمەتگرتنی خەڵک لە فەتوا لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵگە و هەستکردن بە گرنگی و قورسایی پلە و پێگەی فەتوا، دەرکی ئەوە بکرێت کە ئەمە سەرنج و بۆچوونی کەسانێک نییە، یان پرسێکی عەقڵانی نییە، یان سۆز و عاتیفەی دەروون نییە، یان مەبەست لێی خستنەڕووی بەرژەوەندی دنیایی نییە، بەڵکو ڕوونکردنەوە و خستنەڕووی حوکمی شەرعی خودایە بۆ بەندەکانی بە بەڵگە و حوکمی ئاشکرا.

**دووەم**: دەرکردنی فەتوا لەسەر بناغەیەکی پتەوی شەرعی پشت ئەستوور بە قورئان و فەرموودە، یان سەرچاوەکانی تری وەک ئیجماع و قیاس، یان ئەسڵێکی شەرعی باوەڕپێکراو.

**سێیەم**: کاریگەر نەبوون بە هەر فشارێکی دەرەکی و ناوخۆیی کە کاریگەری هەبێت لەسەر موفتی لە کاتی دەرکردنی فەتوا و ڕوونکردنەوەی حوکمی شەرعیدا، خودا دەفەرموێت: (الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَداً إِلَّا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبا) (الأحزاب : ٣٩ ).

**چوارەم**: خۆدوورگرتن لە کافرکردنی هیچ کەسێک لە موسڵمانان، چونکە دروست نییە هیچ موسڵمانێک کافر بکرێت مەگەر تاوانێکی کردبێت کە لە بازنەی ئیمان و ئیسلام بیکاتە دەرەوە و هیچ پاساوێک هەڵنەگرێت، بێگومان بە کافرکردنی موسوڵمان لە گەورەترین ئەو تاوانەیە کە پێغەمبەر ئاگاداری لەبارەوە داوە، وەک دەفەرموێت: (إذا قال الرجل لأخيه: يا كافر فقد باء بها أحدهما). (رواه البخاری ومسلم).

**پێنجەم**: خۆپاراستن لە فەتوای سەرلێشێوەنەر و گومڕاکار، ئەو فەتوایانەی هاندان دەکەن بۆ ڕشتنی خوێنی بەناهەق، بەڵکو دەبێت فەتوا پێداگر بێت لەسەر پاراستنی ژیان و کەرامەتی خەڵک و وەک بەرزترین مەبەست لە مەبەستەکانی شەریعەت سەیری بکات.

**شەشەم**: پابەندی بە هەر پرس و بابەتێکەوە کە دەقێکی شەرعی جێگیر و دروست لەبارەیەوە هەبێت لە قورئان و فەرموودەدا، دەبێت گوفتار و کردار بپێورێت بە قورئان و فەرموودەی دروست، هەر کردار و گوفتارێک بەپێی قورئان و فەرموودە بوو قبووڵکراو دەبێت، هەر کردار و گوفتارێکیش پێچەوانە بوو ڕەتدەکرێتەوە، هی هەر کەسێک بێت، لەمبارەیەوە پێشەوا شافیعی دەڵێت: (کۆدەنگی هەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێک سوننەتێکی پێغەمبەری بۆ بسەلمێت نابێت لێی لا بدات لەبەر قسەی هیچ کەسێک).

**حەوتەم**: خۆدوورگرتن لە فێڵی بەتاڵ و بێ بنەما بۆ دەستبردن بۆ حەرامکراوەکان لە شەریعەتدا، وەک پێغەمبەر (د.خ) لە سەرکۆنەکردنی جولەکەدا دەفەرموێت: (خودا جوولەکە بکوژێت، چەوری ئاژەڵیان لەسەر حەرامکرابوو، دەیانتواندەوە و دەیانفرۆشت) (رواه البخاری ومسلم)، لە هاوەڵانەوە ئەوە گێڕاوەتەوە کە فێڵی بەتاڵ حەرامە لە ئیسلامدا.

**هەشتەم**: دەبێت فەتوا بە ڕوونی و جوانی بخرێتە ڕوو، دوور لە درێژییەکی ماندووکار و کورتییەکی بێمانا، لەگەڵ مەرج و کۆت و بەندی پەیوەندیدار بەو حوکمە، بۆئەوەی بە هەڵە تێگەیشتن دروست نەبێت و خەڵکی ئاژاوەگێڕ بە خراپ کەڵکی لێ وەرنەگرێت.

**نۆیەم**: لە پرسە شەرعییەکاندا درێژکردنەوەی زۆر نەدرێت بە بابەتی خیلافی لە کاتی باسکردنی خیلافەکاندا، کەسی موفتی ڕای پەسەندی خۆی بڵێت بە پاڵپشتی بەڵگەکانی.

**دەیەم**: خۆپاراستن لە دەرکردنی فەتوای نامۆ و و پێچەوانە لەگەڵ قورئان و سوننەت، هەروەها پێچەوانە نەبێت لەگەڵ ئەوەی کە پێشینانی باشمان لەسەری بوون، یان لاسایی ئەو فەتوانە نەکرێتەوە کە لە کۆندا هەبوون و پێچەوانە بوون لەگەڵ شەریعەتدا. نەخرێنەوە بەر باس و قسە.

یانزەیەم: شەرعی خودا لەسەر بنەمایەکی وەسەتی داڕێژراوە، نە توندی و پەرگیری بەڕەهایی نە شلگیری و ئاسانکاری بە ڕەهایی، بەڵکو دەبێت لەو نێوانەدا مەبەستەکانی شەریعەت لەبەرچاو بگیرێت وەک مەنهەجی سەلەفی ئوممەت.

**دوازدەیەم**: گرنگیدان بە فەتوای زانایانی خواناس و خوداویست بۆ دڵنیایی زیاتر، برەودان پێیان و گەیاندنیان بە خەڵکی و بڵاوکردنەوەیان، چونکە جێکەوتەی باشی دەبێت لەسەر خەڵک، بۆ برەودان بە نەهجی میانەڕەوی لە بیروباوەڕ و پەرستش و مامەڵە داراییەکاندا، بەوەش خەڵک دوور دەخرێتەوە لە توندڕەویی و شلگیری و توانەوە.

لە کۆتاییدا، بۆئەوەی فەتوا کاریگەری هەبێت و پاڵپشتی بکرێت، واباشترە بەشێوەی دەستەجەمعی فەتوا بدرێت، وەک ئەوەی کە لە ئێستادا بەناوی مەجمەعی فیقهییەوە لە چەندین وڵاتدا بوونی هەیە، بێگومان فەتوای دەستەجەمعی بەشێکە لە کاری هاوبەش و ڕۆڵێکی ئەرێنی دەبێت لەڕووی دروستکردنی تەبایی و یەکڕیزی موسوڵمانان و جێکەوتەی باشی دەبێت لەڕووی ئاڕاستەکردنی خەڵک بەرەو پەیڕەویکردنی زیاتری ئەحکامەکانی شەریعەت.

تێبینی: ئەم بابەتە وەرگیراوە لە کتێبی (میثاق الإجتهاد والفتوا وفق فقه المیزان) لە نووسینی پرۆفیسۆر دکتۆر عەلی قەرەداغی سەرۆکی یەکێتی جیهانی زانایانی موسوڵمان. شایانی باسە بەڕێزیان پێشتر کتێبێکی نووسیوە بەناوی (الإجتهاد والفتوى أهمیتها وشروطها وتطبیقاتهما المعاصرة ودور المەنظمة المقاصیدیة والبعد المقاصیدي فی ضبطهما وتجدیدهما).

– وێڕای ئەم هەوڵانە، بەڕێزیان پرۆژەیەکی تایبەتیان هەیە بۆ پرسی ئیجتیهاد و فەتوا لەسەر ئاستی جیهان، بەناونیشانی (نحو المجمع العالمی للإجتهاد والتجدید والفتوی)، ئەم میساقە ئاماژەمان پێدا بەشێکی ئەو پرۆژەیەیە.

یەکێک لە دیارترین ئەو کێشە و گرفتانەی لەم چەند ساڵەی دواییدا ڕووبەڕووی کۆمەڵگە موسڵمانەکان بووەتەوە پرسی فەتوا و زۆری سەرچاوەکانی فەتوایە کە بۆ خەڵکی موسڵمان بووەتە مایەی سەرئێشە و سەرلێشێواندن، بەتایبەتی دوای دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و ئاسانکاری لە بڵاوبوونەوەی فەتوای جۆراوجۆر لەسەر یەک پرس و ئاریشە.

ئەم دیاردەیە فەوزا و پەرتەوازەیی لەناو کۆمەڵگەدا خوڵقاندووە و میسداقیەتی ڕۆڵی ئایین و زانایانی ئیسلامی خستووەتە ژێر پرسیارەوە، لەکاتێکدا زانایانی ئایینی لە ڕابردوودا سونبولی تەبایی و یەکڕیزیی و فاکتەری چارەسەری کێشە و گرفتەکانی کۆمەڵگە و وەڵامدەرەوەی بابەتیانە و شەرعی پرسیارە شەرعی و ئایینیەکانی خەڵک بەشێوەیەکی دڵنیاکەرەوە بوون. فەوزای فەتوا و دەخالەتی زۆر کەسی ناپسپۆڕ و نەشارەزا لە هەندێ بابەت و پرسی ئایینیدا حاڵەتێکی دەروونی ناسەقامگیری بۆ خەڵک دروستکردووە، کە بۆ وەرگرتنەوەی وەڵامی پرسیارێک موفتییەکانی سەردەم چەندین پرس و پرسیاریتریان بۆ دەخوڵقێنن و لەناو حاڵەتێکی دەروونی نائاساییدا نغرۆی گومان و دوودڵییان دەکەن.

کۆمەڵگەی ئێمە بارگاوییە بە ئایین و دیاردەی پابەندی ئایینی، بواری فەتواش کایەیەکی هەستیارە کە زۆرینەی ڕەهای کۆمەڵگە بەهەند وەریدەگرێت و لە ژیانی تاکەکاندا کاریگەری بەرچاوی دەبێت، تەنانەت زۆربەی ئەوانەش کە لە ئەنجامدانی پەرستشەکاندا پابەندیی تەواویان نییە، لە زۆربەی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و خانەوادەییاندا فەتوا و گوتاری ئایینی کاریگەری لەسەر ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکانیان هەیە. بۆیە ئەم کایە گرنگەی کە پەیوەستە بە ئایین و بزووتنەوەی ژیانی کۆمەڵگەوە دەبێت بەئاگاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و تێکەڵ بە ویست مەرام و بەرژەوەندی هیچ کەس و چین و گرووپ و دەسەڵاتێک نەکرێت و بە پێوەر و پرانسیبی شەرعی و ئوصولی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

فەتوا کارێکی سادە و ئاسایی نییە کە تەنها دەربڕینی بیروڕایەک بێت لەسەر پرس و بابەتێکی شەرعی، بەڵکو ئەو کارە بەرپرسیاریەتییەکی گەورە و هەستیارە، چونکە کاریگەریی و دەرەنجامی مەیدانی لێ دەکەوێتەوە لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵگە، مامەڵەی نابەرپرسانە لەگەڵ ئەم کایە ئاینییەدا، یان ئەدای فەتوا لەلایەن کەسانی ناپسپۆڕ و نەشارەزا فەوزا و پشێوی لەناو کۆمەڵگەدە دەخوڵقێنێت.

هەر بەهۆی ئەو ڕۆڵ و کاریگەرییە گرنگەی فەتوای ئاینییەوە لەسەر تاک و کۆمەڵگە و دەوڵەت، لەهەموو کاتێکدا ئەم فەتوایە ڕۆڵەکەی دوو سەرەیە، دەکرێ ئاگرێکی فیتنە و ئاشوب بکوژێنێتەوە، دەشتوانێت ئاژاوە و فیتنەیەک بخولقێنێت، ئەگەر لە کەسانی زانا و بە ئەزموونەوە سەرچاوەی نەگرتبێت.

لە حاڵەتی مامەڵەی ناروست و ئەداکردنی فەتوا لەلایەن کەسانی نەشارەزا و بێ ئاگا لە ئوصوڵ و مەقاصاید و نەخوێندنەوەی پێوەرەکانی خۆلادان لە (مەفاسید) و گەیشتن بە سوود(مەنافیع)، لەوانەیە فەتوایەکی هەڵە وڵاتێک  وێران و پڕ لە ئاژاوە بکات، بۆیە قورئانی پیرۆزیش ئەوەی دووپاتکردووەتەوە کە مرۆڤ نابێت بە نەزانی و نە شارەزایی حوکم بدات ( وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً) الإسراء:٣٦.

بەداخەوە ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین بێ بایەخکردنی فەتوا و خولقاندنی فەوزایە لەناو کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا کە کاریگەری فەتوا و حوکمە شەرعییەکان لەسەر هەموو بوارەکانی ژیانی هەیە، ئەم کاریگەرییە لەگەڵ فرەفەتوایی و جورئەتی فەتوادان لەلایەن کەسانێکەوە کە زۆربەیان شارەزا و پسپۆڕی ئەو بوارە نین جۆرێک لە ناسەقامگیری دەروونی بۆ خەڵک دروستکردووە، کە ئەگەر چارەسەر نەکرێت شوێنەواری زۆر خراپ لەسەر ئاسایش و سەقامگیری کۆمەڵایەتیش دروست دەکات.

گونجاوترین چارەسەر بۆ کۆتاییهێنان بەفەوزای فرەفەتوایی بریتییە لە وەرگرتنەوەی ئەو مافە لە کەسانی نا ئەهل و کاراکتەرەکانی ناو سۆشیالمیدیا و ڕێکخستنەوەی کایەی ئایینی فەتوا لەچوارچێوەی دامەزراوەیەکی زانستی و پیشەییدا کە ببێتە مەرجەع بۆ بەیانکردنی حوکمی شەرعی لەسەر پرس و پێشهاتەکان و وەڵامی شەرعی هاووڵاتیان. ئەم دامەزراوەیە بەهەر شێوازێک پێکبهێنرێت کێشە نییە، گرنگ ئەوەیە بابەتەکە لەکاری تاکەکەسی و هەرکەس بۆ خۆیەوە بکرێتە کارێکی بە کۆمەڵی ڕێکخراو کە دڵنیایی بۆ هاوڵاتی مسوڵمان بگێڕێتەوە و لەکۆتاییدا دەروونی ئاسوودە و دڵنیابێت بەو وەڵامە شەرعیانەی لە دەزگا ئاینییەکەی فەتوا و حوکمی شەرعی وڵاتەوە دەردەچێت.

کاری بەکۆمەڵ و دامەزراوەیی لە بواری فەتوادا بەو واتایە نییە کە فەتوای تاکەکەسی شەرعیی نییە و زانایان بۆیان نییە لە هیچ حاڵەتێکدا دەست لە فەتوا وەربدەن، نەخێر، بنەمای ڕەوایەتی فەتوا زانست و زانیارییە و زانستی شەرعی

و ئایینی لای هەرکەس هەبێت مافی فەتوادانی هەیە، بەڵام بۆ ئەمڕۆ پێویستمان بەڕێکخستنەوەی پرۆسەکەیە لەچوارچێوەیەکی ڕێکخراوی هاوچەرخدا لەبەر چەند هۆکارێک، لەوانە:

یەکەم: لەسەر ئاستی تاک متمانە بە فەتوا و کاری زانستی زانایان دروست دەبێت کاتێک فەتوا بەشێوەیەکی دروست دێتە بەردەستی و سەقامگیری دەروونیی بۆ دەگەڕێتەوە. تاکیش یەکەی یەکەمی کۆمەڵگەیە و یەکڕیزی و تەبایی کۆمەڵگەش مەبەست و ئامانجی ئیسلامە، بۆیە لەسەر ئاستی کۆمەڵگەی موسڵمانیش سەقامگیری تاکەکان دەبێتە گرنتی بۆ تەبایی و یەکڕیزی کۆمەڵگەش، بۆ ئێستا کە کۆمەڵگە ڕووبەڕووی گرفتی زۆری سەرچاوەکانی فەتوا بووەتەوە و فەوزای خوڵقاندووە، ناچاری ئەوەمان بەسەردا دەسەپێنێت کە پرۆسەی فەتوا لە کاری تاکەکەسییەوە بگۆڕین بۆ کاری بەکۆمەڵ و دامەزراوەیی، لەسەر ئاستی دەوڵەتیش کاتێک کۆمەڵگە بە بایەخەوە فەتوای لێوەردەگرێت، ئەویش ناچار دەبێت وەک مەرجەعی ئایینی دەوڵەت مامەڵەی لەگەڵ بکات.

دووەم: سەردەمی ئەمڕۆ سەردەمی کاری دامەزراوەیی خاوەن میتۆد و دیسپلینە و سەردەمی کاری تاکەکەسی لە بوارە گرنگ و هەستیارەکاندا کە پەیوەندیان بەکاروباری گشتی کۆمەڵگەوە هەیە هەموو گرفتێک چارەسەر ناکات.

سێیەم: عەقڵی دەستەجەمعی سەرکەوتووترە لە کردنەوەی گرێ کوێرەکان و چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگە، ئەم جۆرانە لە کاری دامەزراوەیی زیاتر لە هەڵە و کاری تاکڕەوی پارێزراو دەبێت و کەسە تایبەتمەندەکان تیایاندا لەسەر بنەمای پسپۆڕیی و پیشەیی کارەکەیان ئەدا دەکەن.

چوارەم: لەبەرئەوەی حوکمە شەرعییەکان و پرۆسەی فەتوادان لەسەر کێشەکانی ژیانی کۆمەڵگە فرەڕەهەندن و ئوصولی گەیشتن بە حوکمی شەرعیش تێگەیشتنی دروست و بابەتی دەوێت لە واقیعی کۆمەڵگە و سروشتی کێشەکان، دەکرێت سوود لە پسپۆڕییە زانستییەکانی دەرەوەی زانستە شەرعییە باوەکانیش وەربگیرێت و کەسانی پسپۆڕی بواری کۆمەڵناسی و دەروونناسی و زانستە هاوچەرخەکانی تر وەربگیرێت و لەناو دامەزراوەی فەتوای وڵاتدا ڕۆڵێکی یارمەتیدەریان پێ بدرێت وەک ڕاوێژکاری تایبەت.

بێگومان فیقهی ئیسلامی زیندوێتی و جووڵەیەکی بەردەوامی تیایە کە لە هەموو سەردەمێکدا بە کەرەستە و ئالییەتی خۆی وەڵامی هەموو پرس و پێشهاتە نوێیەکان دەداتەوە و کۆی ئەو وەڵامانە کە فەتوا و ئیجتیهادی زانایانە سەرمایەیەکی گەورەی فیقهیی بۆ مسوڵمانان بەرهەمهێناوە، بەردەوامیش ئەم فیقهە جوڵاوە لەگەڵ جووڵەی کات و تایبەتمەندی شوێن و ژینگەدا لەگەڵ بزووتنەوەی ژیانی کۆمەڵگەدا ڕێ دەکات.

**زانایانی ئایینی لە ڕابردوودا سونبولی تەبایی و یەکڕیزیی و فاکتەری چارەسەری کێشە و گرفتەکانی کۆمەڵگە و وەڵامدەرەوەی بابەتیانە و شەرعی پرسیارە شەرعی و ئایینیەکانی خەڵك بەشێوەیەکی دڵنیاکەرەوە بوون.**

ئەم بزاوتە فیقهییە بەرهەمی دەرک و عەقڵی زانستی و ئوصولی فەقیهەکانە و پڕە لە جەدەلی زانستیيانەی بەڵگەکاری، فەتوا و ئیجتیهادەکان پرۆسەیەکی گونجێنەر نەبووە لەگەڵ دۆخە تایبەتەکان و بەرژەوەندی کەس ولایەن و دەسەڵاتەکاندا.

موفتی و موجتەهیدەکانی سەردەمی زێڕینی ئیسلامیش هەریەکە بۆ خۆیان مەوسوعەیەکی هەمەچەشنی زانستی و مەعریفی بوون و لەیەک کاتدا لە چەندین بواری مەعریفیدا ئەسپی خۆیان تاوداوە، واتە هەریەکەیان ڕۆڵی دامەزراوەیەکیان بینیوە بە حوکمی فرە پسپۆڕیان لە چەندین بواردا، کە ئێستا چەندین کەسی پێویستە. بۆ ئەم سەردەمە کە پسپۆڕییەکان جیاکراونەتەوە و زانای مەوسوعی وەک ئەوانەی پێشینمان نییە، پێویستمان زیاتر بە کۆدەنگی و هەماهەنگی زانایانە بۆ ئەدای فەتوا و هەڵێنجانی حوکمی شەرعی بۆ پێشهاتە نوێیەکان، ئەم پرۆسەیەش بە کۆبوونەوەی زانایانی پسپۆڕ و شارەزا لەگەڵ یەکتر و پرس و ڕاوێژ و گفتوگۆی زانستی ئەنجام دەدرێت، کۆبوونەوەی ئەم زانایانەش بەپێی بەرنامە

و پلانی زانستی و بۆ تاوتوێی باس و پرسە نوێیەکان لەچوارچێوەی هەیئە و دامەزراوەیەکی ئایینی گەورەدا گرفتی فەوزای فرەفەتوایی و دەستوەردانی نەشارەزایانە لە فەتوای شەرعی تارادەیەکی زۆر چارەسەر دەکات.

یەکەمین جار هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) فەتوای بەکۆمەڵیان مومارەسە کرد، خەلیفەکانی ڕاشیدین کە پرس و پێشهاتێک ڕوویدەدا و حوکمی شەرعی دەویست بۆ مامەڵە لەگەڵیدا، زانا و شەرعزانەکانیان کۆدەکردە و پرس و ڕاوێژیان پێ دەکردن و گفتوگۆیەکی زانستییان بۆ ڕێکدەخستن هەتا دەگەیشتن بە حوکم و فەتوایەکی شەرعی، دنیای ئەو سەردەمە وەک ئەمڕۆ ئاشنا نەبوون بە بنیاتنانی دامەزراوەی زانستی و پیشەیی تایبەتمەند، بەڵام مەبدەئی شورا و پرس و ڕاوێژی دەسەڵات لەگەڵ کۆدەنگی زانایان و ئەهلی فەتوا تارادەیەک ئەو ڕۆڵەی بۆ دەگێڕان کە ئەمڕۆ هەیئە و لیژنە تایبەتەکان و دامەزراوەکان دەیبینن.

بۆ ئەمڕۆی وڵاتانی ئیسلامی و بەتایبەتیش هەرێمی کوردستان پێویستی زۆرمان بەکاری دامەزراوەیی هەیە لەسەر هەموو ئاستەکان و بۆ تێکڕای کاروبارە گشتییەکانی ناو کۆمەڵگە، بەتایبەتی لەمەڕ کایەی ئایینی پرسی فەتوا و لیژنە و دەستە و دامەزراوەکانی فەتوا وەک پێویست نەیانتوانیوە وەڵامدەرەوەی پرسیارە شەرعییەکانی خەڵک بن، بۆیە لە دەرەوەی ئەوانەوە هەریەکە و بەجۆرێک فەتوا لەسەر پرس و بابەتێک دەدات و فرەفەتوایی بووەتە یەکێک لەگرفتەکانی ناو کۆمەڵگەی ئێمەش.

دەبێت بایەخێکی زۆر بە بابەتی فەتوا بدرێت و لەچوارچێوەیەکدا ڕێکبخرێت کە جێگای متمانەی خەڵک بێت و ئەو فەراغەش پڕ بکاتەوە کە کەسانێکی نەشارەزا وەک موفتی جووڵەی خۆیانی تیادا دەکەن. بەوپێیەی فەتوا و هەڵێنجانی حوکمی شەرعی لەناو دەق و سەرچاوەکانی ئاییندا بابەتێکی زانستییە، دەبێت بەمیکانیزمی زانستی و کەرەستەی مەعریفی پێویست کاری لەسەر بکرێت، فەتوای سەرپێیی و دابڕاو لە بنەما و پێوەری زانستی و ئوصولی خۆی خەڵک و کۆمەڵگە بەهەڵەدا دەبات، زۆرجار ئەو فەتوایانەش لەگەڵ مەقاصیدی شەرع و شەریعەتدا ناتەبایە، بۆیە لەم ڕووەشەوە دەبێت دەرەنجامی فەتواکان لەسەر بنەمای توێژینەوە و میتۆدی زانستی بێت و هەموو ڕەهەندەکانی ئەو پرسەی کە حوکم و فەتوای شەرعی دەخوازێت بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوەی وردەوە هەتا دەگاتە هەڵێنجانی

حوكمی شەرعی دروست، ئەمەش لە ئەمڕۆدا بەدام و دەزگای زانستی و دامەزراوە زانستییەکانی فەتوا دەکرێت کە هاوکاری هەر زانا و شارەزایەک بکەن وەڵامی شەرعی بۆ پرس و پرسیارێکی خەڵک ئامادە دەکات.

بەدامەزراوەییکردنی کردەی فەتواداان و سوودوەرگرتن لە توانا و پسپۆڕی زانایان لەچوارچێوەی دامەزراوە و هەیئەتێکی پیشەیی و زانستیدا بۆئەوەیە ئەم دامەزراوە ئایینیە ڕۆڵی مەرجەع و سەرچاوەی فەتوا و ڕێنموونی ئایینی ببینێت بۆ خەڵک و کۆمەڵگە، بۆیە بۆئەوەی ئەم ئامانجەی خۆی بپێکێت و جێگای متمانەی خەڵکی موسڵمان بێت، پێویستە دامەزراوە ئاینییەکە ئەم تایبەتمەندییانەی تیادابێت:

**یەکەم:** پێویستە دامەزراوەیەکی سەربەخۆ و بێلایەن بێت و لەژێر هەژموون و دەسەڵاتی هیچ کەس و لایەن و ئۆرگانێکی فەرمی و نافەرمیدا نەبێت، بۆئەوەی خراپ سوودی لێوەرنەگیرێت بۆ بەرژەوەندی لایەک، حکومەتیش دەست لە کاروبارەکانی وەرنەدات، هەر ئەمەش متمانەی بۆ دروست دەکات لای هاوڵاتی و کۆمەڵگە بەگشتی.

**دووەم:** ستاف و ئەندامانی ئەو دامەزراوە زانستییە لەسەر بنەمای ئاستی زانستی و ئەزموون و شایستەیی و شۆرەتی باشی ناو کۆمەڵگە دیاری بکرێن نەک وەلای سیاسی و نزیکایەتی لە دەسەڵات و حزب و لایەنەکان.

**سێیەم:** دەبێت ئەو هەیئەتەی ئەرکی فەتوا و وەڵامدانەوەی پرسیارە شەرعییەکانیان لەئەستۆیە ئەرکەکەیان بەشێوەی زانستی و پیشەیی خۆی ئەنجام بدەن و حەق و ڕاستی بگەیەنن بەبێ ڕەچاوکردنی ویست و بەرژەوەندی هیچ لایەک، بەتایبەتی دەسەڵاتی سیاسی وڵات.

**چوارەم:** گرتنەبەری میکانیزمی زانستی لە دەرکردنی فەتوا و وەڵامە شەرعییەکاندا، بەتایبەتی لەو بابەتانەدا کە پەیوەستن بەکاروباری گشتی خەڵک و کۆمەڵگەوە پێویستە لەچوارچێوەی توێژینەوەی زانستی و وردەکاری ڕوون و ڕاشکاو لە باتەکان فەتواکان گەڵاڵە بکەن، خۆیان لە دەربڕینی تەمومژاویش بپارێزن.

**پێنجەم:** ئەندامانی دامەزراوەی فەتوا پێویستە کەسایەتی خۆیان بپارێزن و نەبنە بەشێک لە هیچ کێشە و ئاریشەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، بەڵکو دەبێت

پێکەوە چاودێری وردی دۆخی کۆمەڵگە بن و لەسەر بنەمای بەرچاوڕوونی فەتواکانیان دەربکەن.

**شەشەم**: پێویستە حزورێکی میدیایی چالاکیان هەبێت و سوود لە ئامڕازە هاوچەرخەکانی ڕاگەیاندن وەربگرن و لەناویاندا کەناڵی سەربەخۆی خۆیان هەبێت.

**شەشەم**: پێویستە ئەو دامەزراوەیە حەکیمانە مامەڵە لەگەڵ ڕاجیایی زانایان و مەزهەبەکاندا بکات و بەڵگە و میکانیزمی زانستی بکاتە پێوەر بۆ فەتوا و گەیشتن بەحوکمە شەرعییەکان.

حەوتەم: بڕیاری کۆتایی و گەیشتن بە فەتواکان لە دوای گفتوگۆی زانستیانەی وردی زانایانی تایبەتمەندی ناو دامەزراوەکە بێت، لەسەر بنەمای کۆدەنگی یان ڕای زۆرینە فەتوا لەسەر پرس و پێشهاتێک بدرێت.

لەکۆتاییدا ماوەتەوە بڵێین، کۆمەڵگەی موسڵمان بەتایبەتی کۆمەڵگەی کوردەواری ئێمە هەمیشە لە مامەڵەی لەگەڵ پێشهات و ڕووداوەکان و بزاوتی ڕۆژانەیدا کاریگەری ئایینی لەسەرە، بۆیە ئەم جۆرە کایە ئایینیانە ئەگەر بەباشی ڕێکنەخرێت کەسانی نەشارەزا یان خاوەن مەرام و بەرژەوەندی بەخراپ سوودی لێ دەبینن و ڕەوشێکی پێ دەخوڵقێنن کە بەسوودی کۆمەڵگە و پێگەی مەزنی ئایین تەواو نابێت.

**پوختە**

بابانزادە ئەحمەد نەعیم کوڕی کەسایەتی دیار و خاوەن پایەی ئیداریی و کولتووری کورد مستەفا زیهنی ئەفەندی و برا گەورەی ئیسماعیل حەقی بابانزادەیە، بابانزادە ئەحمەد نەعیم ساڵی ١٨٧٢ لە شاری بەغداد لەدایکبووە و دواتر لەگەڵ باوکی چوونەتە ئەستەنبوڵ و لەوێ گەورە بووە و قۆناغەکانی خوێندنی بەسەرکەوتوویی تەواوکردووە.

بابانزادە ئەحمەد نەعیم بەکەڵکوەرگرتن لە ژینگەی خێزانی خۆیی و ژینگەی کولتووری ئەوکاتی ئەستەنبوڵ توانیوویەتی بەجۆرێک خۆی پیبگەیەنێت کە لە زۆر کایەی جیاوازی ڕۆشنبیریی و ئیداریدا ئەسپی خۆی تاوبدات و ببێتە ناوێکی دیاری ناو کایەی ڕۆشنبیریی و کولتووری ئەستەنبوڵ لە دوا دواییەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا.

ناوبراو جیا لەوەی بووەتە مامۆستا لە (دار الفنون) لە ئەستەنبوڵ و چەندین وانە لە نموونەی فەلسەفە و دەروونناسی بۆ یەکەمینجار لە (دارالفنون) گوتووەتەوە و چەندین قوتابی پەروەردە کردووە، لەگەڵیشیدا لە چەند کایەیەکی گرنگ زانستیدا نووسین و وەرگێڕانی ئەنجامداوە و چەندین بەرهەمی گرنگی لەدوای خۆی بەجێهشتووە، بەجۆرێک پەرتووکەکانی لەڕووی چەندێتی و چۆنێتییەوە، ناوبراو دەکەن بە پێشەنگ لەو کایانەی تێیدا نوسراون.

لەم توێژینەوەدا هەوڵدراوە، دوای ئەنجامدانی گەشتێکی خێرا بە وێستگە سەرەکییەکانی ژیانی ناوبراودا بەرهەمەکانی لە پەرتووک و وتارە گرنگەکانی بناسێنرێن، دواتریش لەم توێژینەوەدا هەوڵدراوە لەسەر پەرتووکی» بانگەشەی نەتەوەچێتی لە ئیسلام» دا -کە یەکێکە لە کتێبە پێشەنگەکانی تایبەت بە قسەکردن و نووسین لەبارەی پەیوەندی ناسیۆنالیزم و ئایین لە ناوەند ڕۆشنبیرییەکانی جیهانی ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتدا- بووەستم و دیارترین بیروبۆچوونەکانی لەمەڕ ڕەتکردنەوەی تەوژمی فیکری نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی بخەمەڕوو.

**وشەی کلیلی:**

بابانزادە ئەحمەد نەعیم، دەوڵەتی عوسمانی، نەتەوەچێتی، ڕەگەزپەرستی.

### ١. بابانزادە ئەحمەد نەعیم

بیریار، مامۆستای زمانی عەرەبی لە ئامادەیی گەڵتەسەرای(ئامادەیی سوڵتانی)، مامۆستای فەلسەفە لە دارولفنونی(زانکۆی) ئەستەنبوڵ، وەرگێڕ و بیرۆکرات ئەحمەد نەعیم کوڕی بابانزادە مستەفا زیهنی پاشا و ئیجلال خانم (١٩٥٣مردووە) بووە، ساڵی ١٢٩٠ک/١٨٧٢ز لە بەغدا لەدایکبووە.[١]

باوکی کەسایەتی ناسراوی ئیداریی و زانستی و کولتووری دوا سەردەمی عوسمانی مستەفا زیهنی پاشا بووە، کە لە نەوەی خانەدانەکانی بابان بوون، مستەفا زیهنی ساڵی ١٨٣٨ لە سلێمانی لەدایکبووە، دوای هەڵوەشانەوە و نەمانی میرنیشنی بابان ئەندامانی خانەدانی بابان پەرتەوازە و بڵاوبوونەوە، هەندێکیان چوونە دوورگەی کریت و هەندێکی تریشیان لە دامەزراوە میرییەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا دەستیان بەکارکردن کردووە، مستەفا زیهنی لە بەغدا خوێندوویەتی، هەر لە بەغدایش بووە بە مۆرهەڵگری مەدحەت پاشای والی بەغدا(١٨٦٩-١٨٧٢)، لەوێوە ژیانی ئیداریی و کولتووری دەستپێکردووە.

وەک پێشتر باسکرا، مستەفا زیهنی، دواتر لە بواری ئیدارییدا زۆر پلەی ئیداری گرنگی بەڕێوەبردووە و لە بواری کولتووریی و ڕۆشنبیریشدا بە نووسین و وەرگێڕانی چەندان پەرتووک جێ پەنجەی خۆی لەسەر گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی و کولتووری ئەو سەردەمەی عوسمانیدا جێهێشتووە.[٢]

مستەفا زیهنی پیاوێکی دینداربووە و بایەخێکی زۆری بە بابەتە ئاینییەکان داوە و چەندین پەرتووکی لە بواری ئایینیدا نووسیون و وەرگێڕاون، لەم لایەنەوە لەنێو هەر چوار کوڕەکەیدا زیاتر لە هەموویان بابانزادە ئەحمەد نەعیم شوین پێی باوکی هەڵگرتووە. ناوبراو گرنگییەکی زۆری دەدا بە توێژینەوە لە بواری ئایین و ئیسلامییەتدا، ئەگەرچی ماوەیەک لە دامەزراوەی میری دەوڵەت وەک وەرگێر کاریکردووە، بەڵام لەبری کارکردن وەک فەرمانبەرێکی سادە پێی باشتر بووە

---

1 M. Cüneyt Kaya – İsmail Kara. Babanzâde Ahned Naim Bey’in Hayatı ve Eserleri, İstanbul Ağustos 2018. s.15.

٢ بڕوانە: سامان مستەفا ڕەشید، مستەفا زیهنی، ژیان و ڕۆڵی ئیداری و کلتوری لەدەوڵەتی عوسمانییدا، گۆڤاری زانکۆی جیهان Special Issue) Volume 6 Issue 3(2022)، ل ٤٠-٥٩.

تەواوی ژیانی خۆی بۆ خوێندنەوە و توێژینەوە تەرخان بکات.[3]

ئەحمەد نەعیم هەر لە سەرەتایی منداڵییەوە دەستیکردووە بە خوێندن، دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی، دوای ماوەیەک لە دەستکردنی بە خوێندنی ڕووشدییە لە بەغدادەوە دەچێتە ئەستەنبوڵ و خوێندنی لە ئامادەیی گالاتەسەرایی تەواو دەکات، کە ئەو زەمانە کوڕ و منالی وەزیر و ناودارەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەو ئامادەییە دەیانخوێند. بەوجۆرە خوێندنی مەکتەبی مولکییە و ئامادەیی سوڵتانییە گالاتەسەرایی سوڵتانییەی تەواوکردووە.[4]

ئەحمەد نەعیم عەرەبییەکی زۆرباشی زانیوە، بەگوێرەی تێگەیشتن و ڕەسمی باوی ئەو سەردەمە هەرکەسێک عەرەبییەکی باشی زانیبا، بە واتای ئاگاداربوون و باڵادەستی لە زانستە ئیسلامییەکان و بوونی کلیلی کولتوروی ڕۆژهەڵات لە دەستی ئەو کەسەدا دەهات، بەوشێوە ئەحمەد نەعیم جیالەوەی کلیلی کولتووری ڕۆژهەڵاتی لە گیرفاندا بوو، دەتوانین بڵێین ناوبراو کلیلی کولتووری ڕۆژئاواشی پێ بووە، چونکە لەڕێگەی زانینی زمانی فەڕەنسییەوە ئاگاداری وردی لەمەڕ کولتووری ڕۆژئاواش هەبوو. نووسینی چەندین نوسەری ڕۆژئاوایشی بۆ زمانی تورکی وەرگێڕابوو، زمانی کولتووری ڕۆژئاوایشی فێری قوتابییەکانی ئامادەیی گالاتەسەرای سوڵتانی کردبوو، چونکە ئەو سەردەم زمانی کولتووری ڕۆژئاوایی فەڕەنسیی بوو نەک ئینگلیزی.

لە ئامادەیی گالاتەسەرایدا بابەتەکانی: فیزیا، کیمیا، بیرکاری، جوگرافیا و مێژووی وتووەتەوە و چەندان قوتابیی زیرەکی پێگەیاندووە، هەرچی لە قوتابخانەی مولکییەشدایە بابەتی پەیوەندیدار بە ئیدارە و بەڕێوەبردن وتووەتەوە.[5]

ژیانی فەرمانبەرێتی بابانزادە ئەحمەد نەعیم بۆ یەکەمجار لەساڵی ١٨٩٤ دەستپێدەکات، کە ئەوکات لە بەشی وەرگێڕانی وەزارەتی دەرەوە وەک وەرگێڕی زمانی عەرەبی دامەزراوە، لە ساڵی ١٨٩٥ لەپاڵ ئەو ئەرکەیدا، بە مامۆستایی

---

3 Jabar Kadir. Babanzâde Ahmed Naim 1873-1934(Kürtçe). www.WtariKurd.info. Ereşim tarihi.8.7.2022. s.1.

4 Hüseyin Hansu. Secdede Biten Bir Ömür: Babanzâde Ahmed Naim Bey, DİN VE HAYAT. EKIM 2015. S. 80.

5 Jabar Kadir, a.g.m.2.




زمانی عەرەبی لە ئامادەیی گالاتەسەرای سوڵتانییە دادەمەزرێت. ماوەی زیاتر لە دە ساڵ لەو ئەرکانەیدا کاریکردووە، دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتەی دووەم لە ساڵی ١٩٠٨ چووەتە وەزارەتی مەعاریف، لە تشرینی یەکەمی ١٩١٥ لە کۆلیژی ئاداب و شەریعەدا بە ماموستا دانراوە، لە ماوەی نێوان تشرینی یەکەمی ١٩١٨ بۆ تشرینی یەکەمی ١٩١٩ ماوەیەکی کورت کراوە بە ڕاگری کۆلیژی ناوبراو، لە ساڵی ١٩١٩ کراوە بە ئەندامی ئەنجومەنی پیران(مەجلیسی ئەعیان)، ئەندامێتی لە ئەنجومەنی پیران تاوەکو تەسفییەکردنی حکومەتی ئەستەنبوڵ لە ٤ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ بەردەوامبووە.[٦]

هەروەها دوای بوونی بە مامۆستا لە بەشی فەلسەفە، لە کۆلێژی ئاداب و شەریعەدا، بابەتەکانی: فەلسەفە، حیکمەت و ڕوحییات (سایکۆلۆجی)، ئەخلاق، لۆژیک، میتافیزیک و ئیستاتیک وتووەتەوە (١٩١٠ تاوەکو ١ی ئەیلولی ١٩٣٠)، وەرگێران و ئامادەکردنی بەشێکی زۆر لەو بابەتانەی کە هەندێکیان بۆ یەکەمجار بووە لە دارالفنونی ئەستەنبوڵ گوتراونەتەوە کراون بە کتێب.[٧] بەوشێوە بابانزادە لەو بوارانەدا زۆر خۆی بەرەوپێشبردووە، هەروەها لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٠٨-١٩١١ قوتابخانەی ڕووشدییە بەڕێوەبردووە، لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩١١-١٩١٥ سکرتێری گشتی وەزیری مەعاریف بووە. لە ساڵی ١٩١٤ بە مامۆستا لە کۆلێژی ئەدەبیات و ئیلاهیات دامەزراوە و تاوەکو ١٩٣٣ درێژەی بەم کارەی داوە. لە ساڵی ١٩١٩ بووە بە سکرتێری گشتی زانکۆی ئەستەنبوڵ، بابانزادە کە لە پێشدا لە ئامادەیی گالاتەسەرای، دواتر لە کۆلێژی ئادابی دارالفنون کە دواتر لە ساڵی ١٩٣٣ گۆڕاوە بە زانکۆی ئەستەنبوڵ، کاریکردووە و چەندان کەسایەتیی پێگەیاندووە، بەهۆی خزمەت و نوسینەکانییەوە زۆر بەناوبانگ بووە، ئەحمەد نەعیم لەلایەن زۆربەی قوتابی و مامۆستاکانیشییەوە، هەم بە کەسایەتییەکی زانا و شارەزا، هەمیش بە کەسێکی دڵسۆز و خاکەڕا باسی لێوەکراوە.[٨]

---

6 Receb Kılıç, Ahmet Naim ;hayatı ve eserleri, İslam ahlakının esasleri, önsöz içinde, s.12.

7 M. Cüneyt Kaya – İsmail Kara. Babanzâde Ahned Naim Bey’in Hayatı ve Eserleri, İstanbul Ağustos 2018. S.18-19.

8 Jabar Kadir, a.g.m.2.

لەو ساڵانەشی لە بەڕێوەبەرایەتی وەرگێڕان لە وەزارەتی مەعاریف ئەندام بووە، لە کارەکانی ئەنجومەنی ڕیفۆرمی زانستیدا و لە ئامادەکردنی زاراوە فەلسەفییەکان و زاراوە زانستییەکاندا ڕۆڵێکی گەورەی گێڕاوە.[٩] ئەم زانا گەورەیە ڕۆژی ١٣ی ئابی ١٩٣٤ لەکاتی سوجدە بردندا لە نوێژی نیوەڕۆ کۆچی دوایی کردووە، دواتر لە گۆڕستانی ئەدەرنە کاپی بەخاک سپێردراوە.[١٠] شاعیری گەورە محەمەد عاکیف خاوەنی سروودی نیشتیمانی تورکیا، وتوویەتی: کاتێک هەواڵی کۆچی دوایی بابانزادە ئەحمەد نەعیمیان پێدام وەک ئەوە وابوو تەواوی خانووەکەم ڕووخابێت بەسەرمدا و من لەژێر داروپەردوودا مابمەوە. وەک گوزارشتێک بۆ ئەندازە کاریگەربوون بە هەواڵەکە.[١١]

بەکورتی، بابانزادە ئەحمەد نەعیم لە ماوەی کاری مامۆستایەتیدا ژمارەیەکی زۆر قوتابی پەروەردە کرد، بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئایندەی قوتابییەکانی بێوچان تێکۆشاوە، هەر لەبەرئەوەشە لە تورکیادا ئەوانەی ناسیوویانە و ئەوانەشی شوێن پێی ئەویان هەڵگرتووە ڕێزێکی زۆریان لێگرتووە و خۆشیان ویستووە. هەروەها ئەحمەد نەعیم لە مێژووی فەلسەفەدا لە تورکیا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە، وەکو یەکێک لە زانایانی دەوڵەتی عوسمانی زۆرێک لەو نووسینانەی نووسیونی لە بواری خۆیاندا بوون بە سەرچاوەی گرنگ، لەهەمانکاتدا نووسین و توێژینەوەکانی لە بواری زانستی ئایینی و وەرگێڕانی فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) بۆ زۆرێک لە خەڵک بوون بە ڕێپیشاندەر، هەروەها هێنانی ئەو تێرمانەش بۆ ناو زمانی تورکی، ڕۆڵی لە دەوڵەمەندکردنی زمانی تورکیدا بینیوە.[١٢]

9 İslam Ahlakının Esasları, notlar ilave ederek sadeleştiren Prof. Dr. Recep Kılıç, Türkiye Diyanet Vakfı, 2 basık, Ankara 2014. S.12.

10 Hüseyin Hansu. Secdede Biten Bir Ömür: Babanzâde Ahmed Naim Bey, DİN VE HAYAT. EKIM 2015. S. 15-45.

11 Fatma Yıldız. Babanzâde Ahmed Naim'in "İlmü'n-Nefs" Adlı Eserinin Tahlili Ve Çeviri Yazısı, Yüksek Lisans Tezi, İstanbul Üniversitesi 2014. S. 8.

12 Fatma Yıldız. a. g. e. s. 10.




## ٢. بەرهەمەکانی بابانزادە ئەحمەد نەعیم

١.٢. پەرتووکەکانی بابانزادە ئەحمەد نەعیم

بابانزادە ئەحمەد نەعیم، ژمارەیەکی بەرچاو پەرتووکی دانراو و وەرگێڕاو و بابەتی نوسراوی هەیە، نەوەی سەردەمی جمهورییەت لە تورکیا ئەحمەد نەعیم زیاتر لە ڕێگەی سێ بەرهەمییەوە دەناسن، ئەوانیش( Tecrid-i Sarih Tercümesi، Ahlak-ı İslamiye Esasları، İslam'da Davayı Kavmiyet)، یەکەمیان وەرگێرانی فەرموودەکانی سەحیحی بوخارییە لە عەرەبییەوە بۆ زمانی تورکی، هەرچی پەرتووکی دووەمە بەناوی بنەماکانی ئەخلاقی ئیسلامی تێیدا تێڕوانینەکانی بۆ ئەخلاقی ئیسلامی خستۆتەڕوو، لە پەرتووکی بانگەشەی قەومییەت لە ئیسلامیشدا بنەماکانی بیری ئیسلامگەرایی خۆی تێدا خستۆتەڕوو.[١٣]

بنەماکانی ئەخلاقی ئیسلامی .Ahlak-ı İslamiye Esasları

تێکستی ئەم پەرتووکە لە بنەڕەتدا لەلایەن بابانزادە ئەحمەد نەعیم لەسەر داوای وەزیری مەعاریف نورولڵا بەگ ئامادەکرا، کە ناوبراو بەمەبەستی بەشدارییپێکردنی لە دووەمین کۆنگرەی نێودەوڵەتی پەروەردەی ئەخلاقی لە لاهای، تێکستەکەی فراوانتر کردووە، دواتریش دوای بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەی (سبیل الرشاد) و پێداچوونەوەی لەلایەن چاپخانەی (Amedi) لە ئەستەنبوڵ لە ساڵی ١٩٢٤ چاپ و بڵاوکراوەتەوە. شایەنی باسە ئەم پەرتووکە چەند جارێک چاپ و بڵاوکراوەتەوە لەوانە: خورشید کازم ئەلبەیاتی بەناونیشانی (اسس الاخلاق الاسلامیة) لە ساڵی ١٩٥١ لە چاپخانەی (دار الحدیث) لە میصر چاپی کردووە، هەروەها (Ö. R. Doğrul) تێکستی عوسمانی ئەو پەرتووکەی کردووە بە لاتینی و تورکی نوێ و بەناوی(بنەماکانی ئەخلاقی ئیسلامی) و دووجار لە ئەستەنبوڵ چاپیکردووە، جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٤٥ لە (Yüksel yayınevi) و جاری دووەم لە ساڵی ١٩٦٣ لە دەزگای چاپی (Yücel yayınevi) چاپ و بڵاویکردووەتەوە، لە هەردوو جارەکەدا عوسمان نوری ئەرگین پێشەکی و پێشکەشکردنی بۆ نوسیووە. دواتریش، ئەم پەرتووکە دووجار لەلایەن (Recep Kılıç)ەوە چاپ و بڵاوکراوەتەوە، جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٩٥ لە ئەنقەرە و جاری دووەمیش لە ساڵی ٢٠١٠ دیسانەوە لە ئەنقەرە.[١٤]

---

13 Recep Kılıç, a.g. e. S. 301-302.

14 M. Cüneyt Kaya – İsmail Kara. Babanzâde Ahned Naim Bey'in Hayatı ve

بانگەشەی نەتەوەچێتیی لە ئیسلامدا- İslam’da Davayı Kavmiyet

ئەم پەرتووکە یەکێکە لە گرنگترین پەرتووکەکانی بابانزادە ئەحمەد نەعیم کە تێیدا جیالەوەی کەوتووەتە ڕەتدانەوە بانگەشەی نەتەوەچێتی تورکەکان لەو سەردەمەدا و هەوڵیداوە بیسەلمێنێت کە نەتەوەگەرایی و زاڵکردنی نەتەوەیەک بەسەر ئەوانی تردا پێچەوانەیە لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا، لەم پەرتووکەدا کەوتووەتە سۆراغی پەیوەندی نێوان نەتەوەگەرایی و ئیسلام، بە نووسینی ئەم پەرتوکەش دەبێتە پێشەنگی ئەوانەی لەبارەی پەیوەندی نێوان ئایین و نەتەوەگەراییان نووسیوە لە جوگرافیای ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا.

شایەنی باسە، ناوەڕۆکی ئەم پەرتووکە بۆ یەکەمجار لە ژمارە (٢٩٨)ی ڕۆژنامەی (سبیل الرشاد)دا بڵاوکراوەتەوە لەساڵی ١٩١٤، دواتر ئەم پەرتووکە لاتینیزەکراوە و چاپ و بڵاوکراوەتەوە.[15]

بابانزادە ئەحمەد نەعیم ژمارەیەکی بەرچاو پەرتووک و دانراوی تری هەن لە نموونەی: ڕاهێنانی تایبەت بە ڕێزمانی عەرەبی Temrînât Sarf-ı Arabî’ye Mahsus Temrînât، وانەکان حیکمەت (Hikmet Dersleri)، وانەکانی فەلسەفە(Felsefe Dersleri)، لە بنەماکانی فەلسەفە و دەروونناسی(Mebâdî-i Felsefeden İlmü’n-nefs)، زانستی لۆژیک(İlm-i Mantık) و چل فەرموودە(Kırk Hadis) ... هتد. دەتوانین بڵێین ئەحمەد نەعیم بەم پەرتووکانەی کە بەگشتی ناوەڕۆکی فەلسەفییان هەیە توانیویەتی زمانێکی نوێی پەیوەندیدار بە فەلسەفە لە زمانی عوسمانییدا بینا بکات. ئەگەر بەوردی لە دانراوەکانی بکۆڵینەوە.

ئەوا بە ئاسانی بۆمان دەردەکەوێت، ئەو بابەتانەی ناوبراو توێژینەوەی لەبارەوە کردوون و لەسەریان وەستاوە، بەگشتی بابەتی فەلسەفین، بەتایبەتیش لەمەڕ بابەتەکانی: فەلسەفەی مێژوو، فەلسەفەی ئایین، فەلسەفەی ئەخلاق و فەلسەفەی زمان، لەو ڕێگەوە کەرەستە و سەرچاوەیەکی زۆری بۆ ئارەزوومەندانی فەلسەفە فەراهەمکردووە.[١٦]

---

Eserleri, İstanbul Ağustos 2018, s. 41_42.

15 Şengül Özoğul. Babanzâde Ahmed Naim’in Felsefe Algısı ve Ele Aldığı Felsefi Problemler, Yüksek Lisans Tezi, Necmettin Erbakan Üniversitesi 2016, S.

16 Fatma Yıldız. a. g. t, s. 12





## ٢.٢. وتارەکان

بابانزادە ئەحمەد نەعیم لەگەڵ ڕۆژئاواگەراکانی وەکو: حسێن جاهید، تۆفیق فیکرەت، ئەحمەد ئەمین و ڕەزا توفیق لە شەڕێکی فیکری سەختدا بووە، بیروبۆچوونە تایبەتییەکانی خۆی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی وەکو:(ثروت الفنون، صراط مستقیم و سبیل الرشاد) بڵاو دەکردەوە. لێرەدا چەند وتارێک لە وتارەکانی بابانزادە ئەحمەد نەعیم بەنموونە دەهێنینەوە:

چەند نموونەیەک لەو وتارانەی لە (ثروت الفنون)دا بڵاویکردونەتەوە:

- “İbn-i Fâriz’den”, c.15, sayı 385,16 Temmuz, 1314-1896, s.330.
- “Seme’elin bir Fahriyesi”, c.16, sayı 392, 13 Eylül, 1314, s.23.
- “İbn-i Fâriz’den”, c.16, sayı 396, 1Teşrin-i evvel 1314, s.87.
- “Kays-ı Âmirî’nin Garamiyatı’ndan”, c.16, sayı 404, 26 Teşrin-i sani, 1314, s.215.

چەند نموونەیەک لەو وتارانەی لە (صراط مستقیم) بڵاویکردوونەتەوە:

- “Devr-i İstibdad’da Mekteb-i Sultânî’de verilen derslerden:İlm-i Tevhid’in Tarifi, Süret-i Tedvini, Gayesi”, c.1,sayı 3;14 Şâban 1326, s.37-38.
- “İlm-i Tevhid’in Tarifi, Süret-i Tedvini, Gayesi”, c.1, sayı 4;21 Şâban 1326, s.55-57.
- “İlm-i Tarih Sıdk-ı Nübüvvet-i Muhammediyye-i Cenab-ı Peygamber’in Süret-i Neş’et ve zuhurile İsbat Eder”, c.1, sayı 10, 1Şevval 1326, s.153.
- “Sıdk-ı Nübüvvet’in Tarihen Sübut-u Maba’d”, c.1, sayı 11, 10 Şevval 1326, s.172-173.
- c.1, sayı 15, 9 Zilka’de. 1326, s.232-233; c.1, sayı 19, 7 Zilhicce. 1326, s.296-297.

چەند نمونەیەک لەو وتارانەی لە (سبیل الرشاد) بڵاویکردوونەتەوە:

- “Ta’lim-i İlmde mi Haram?”, c.11, sayı 282, 27 Zilhicce 1331, s.177.
- “Müdafaa-i Diniyye: Taaddüd-ü Zevcat İslamiyyette Men’Olunabilir mi imiş?”, c.12, sayı 298, 300; 3\17 Receb 1332, s.216,248.
- “Müdafaa-i Diniyye; Li’l – Batıli savletün … (Batılın Dehşetli Bir Savleti Olabilir Ama Çok Sürmez, Muzmehil Olur)”, c.12, sayı 304, s. 309-314.
- “Müdafaa-i Diniyye: İnsafın O yerde Namı yok mu?”, c.12, sayı 306, 27 Şâban, 1332, s. 351[17]

---

١٧ بۆ وردەکاریی زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:
Ayrıntılı bilgi için Bkz, Recep Kılıç, a.g.m, s.13-16; M. Cüneyt Kaya – İsmail Kara, a.

## ٣. بابانزادە ئەحمەد نەعیم و ڕەتدانەوەی بیری نەتەوەپەرستی

لەکۆتایی سەردەمی عوسمانیدا بیری نەتەوەپەرستی و ڕەگەزپەرستی وەکو شەپۆلێکی فیکری لەناو خەڵکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا بڵاوببوویەوە، بەجۆرێک کە دوای سەردەمی تەنزیمات، سەرەڕای ئەوەی سەرانی دەوڵەتی عوسمانی لە هەوڵی دروستکردنی یەک شوناسی عوسمانیدا بوون، بەڵام جوڵانەوەی بیری نەتەوەپەرستی و ڕەگەزپەرستی لەناو هاوڵاتیانی دەوڵەتی عوسمانیدا خێراتربوو. لە هاوڵاتیانی کریستیانی دەوڵەتی عوسمانی وەکو: سرب، بولگار، مەکەدۆنی و ئەرمەنییەکاندا جوڵانەوەی نەتەوەپەرستی بەهێز ببوو، کەوتبوونە هەوڵی دامەزراندنی ڕێکخراو بۆ پاراستن و بەرگریکردن لەو بیرکردنەوەیان، ئەمە لەکاتێکدا لەنێو ئەو هاوڵاتییانەی زۆرینەیان مسوڵمان بوون وەکو عەرەب و ئەلبانی بیری نەتەوەپەرستی کولتووری بەهێز ببوو. ئەگەر لەنێو گرووپی یەکەمدا بیری نەتەوەپەرستی بە گوزەری کات بەرەو دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان و جیابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانی ئاڕاستەی کردبێتن، ئەوا لە گرووپی دووەمدا بیری نەتەوەپەرستی زیاتر لەنێو چوارچێوەی شوناسی عوسمانیدا دروستکردنی شوناسێکی تێکەڵی دەدا لە نموونەی (عەرەب- عوسمانی) و ( ئەلبانی- عوسمانی) کردبووە ئامانج.[١٨]

سەربارەت بەسەرهەڵدانی بیری ڕەگەزپەرستی لای تورکەکان، زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ تازەیی ئەم جوڵانەوە و زۆر دێرین نەبوونی مێژووی ئەو جوڵانەوە کردووە، بۆ نموونە بەگوێرەی بیروباوەڕی یوسف ئاکچورا: «جوڵانەوەیەکی سیاسی تورکی کە پشت بە ڕەگەز ببەستێت بۆ دروستکردنی شوناس شتێکی یەکجار نوێیە، جا چ لە دەوڵەتی عوسمانیدا یان لەو دەوڵەتە تورکییانەی تردا کە هاتن و چوون بوونی فیکرێکی وەهام نەبینیووە.»[١٩]

بەشێوەیەکی گشتی بیری تورکچێتی لەناو تورکەکاندا لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم(١٨٧٦-١٩٠٩)دا گەشەی کردووە، گفتوگۆ و مشتومڕی

---

g.e, s.37-44.

18 M.Şükür Hanioğlu, Türkçülük;xıx yuzılıda osmanlı devletleri'nde entelektüel düzeyde başlayan, daha sonra siyasal ve ideolojik boyut kazanan hareket, pantürkizim. İslam Ansiklopedesi.İslamansiklopedesi. org.tr.

19 Yusuf akçura, Üç tarz-ı siyaset, Türk tarih kurumu,8 baskı, Ankara ,2018. s. 22.




سیاسی تورکچێتی لەنێو گۆڤار و بڵاوکراوەکانی ژۆن تورک، کە لە دەرەوە چاپیان دەکرد و بەنهێنی دەیانناردە ویلایەتەکان دەستپێکردووە. هەروەها لە دوای کۆنگرەی حورییەتپەروەرەکانی ساڵی ١٩٠٢، لەگەڵ بڵاوکراوەکانی ئەحمەد ڕەزا بەگەوە و لە بڵاوکراوەی (شورای ئوممەت) کە ئۆرگانی ئەو هاوپەیمانێتییە بووە کە لەلایەن ئیتیحادچییەکانەوە بەدیهاتبوو، هێدی هێدی بیری عوسمانیچێتی بەرەو بیری تورکچێتی خزاوە، بەتایبەتی ژۆن تورکەکانی میسر یەکەمین بەرهەمی سیاسی تورکچێتییان بڵاوکردووەتەوە، دەکرێت گۆڤاری(ئەنادۆڵ) کە لەلایەن سولەیمان واحید و تەرسوسزادە مونیف بەگەوە بڵاوکراوەتەوە نمونەی یەکەمین بن لەم بوارەدا. بەڵام یەکەمین ڕۆژنامە کە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایدۆلۆژیای تورکچێتی لە قاهیرە بڵاوکرایەوە ناوی ڕۆژنامەی (تورک- TÜRK) بووە، لەو گۆڤارەی کە هەریەکە لە شەرەفەدین مەغموری، نەجمەدین عارف، جەلالەدین عارف، عەلی کەمال و ئەسعەد بەگ لە ٥ی تشرینی دووەمی ١٩٠٣ بڵاویانکردووەتەوە، لە یەکەمین ژمارەیدا لە گوتاری (تورک) باسیان لەوە کردووە گۆڤارەکە بۆ (پاراستنی مافی تورکەکان، پەروەردەکردنی زیهنی تورکەکان، چالاکردنی فیکریان) دامەزراون، دواتریش جەختیان لە سەروەرێتی تورک بەسەر نەتەوەکانی تردا کردووەتەوە.[٢٠]

بەوشێوە لە سەردەمی بابانزادە ئەحمەد نەعیمدا، بابەتی ڕەگەزپەرستی و نەتەوەپەرستی ببووە ڕۆژەڤی ناوەندی کولتووریی و سیاسی، بەڕادەیەک ڕەگەزپەرستی و تورکچێتی وەکو تەوژمێکی فیکری ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بڵاوبووەتەوە، بابانزادە ئەو تەوژمەی بەتوندی ڕەتدەکردەوە و چووە سەنگەری دژایەتیکردنەوە لەگەڵ ئەوانەی بانگەشەی بیری (ڕەگەزپەرستی و تورکچێتی) یان کردووە، بەوهۆیەشەوە بەردەوام لەگەڵ ڕابەرانی بیری ڕەگەزپەرستیدا مشوتومڕی کردووە، بەتایبەت مشومڕ و وتوێژەکانی لەگەڵ: ئەحمەد ئاغائوغڵو، زیاگۆگ ئەڵپ، فواد کوپیەرلۆ و یەحیا کەمال، لە ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژگارەدا بڵاوکردووەتەوە.[٢١]

بەگوێرەی سەرچاوەیەک ئەحمەد نەعیم بەمجۆرە باسی لە بیری ڕەگەزپەرستی و نەتەوەچێتی کردووە: «ئەحمەد نەعیم زانایانی ئومەتی لەمەڕ ئەوەی پێویستبووە

20 M. Şükür Hanioğlu, a. g. m.

21 Osman Nuri Ergin, babanzade Ahmet Naim, şehsiyeti ve eserleri, s.155.

بکرێت ئاگادارکردووەتەوە، ئەو بیرکەرەوەیەک بووە، بەشێوەیەکی جدی لە بەرانبەر ئەوانەی ویستوویانە لە ڕێگەی بیری (ڕەگەزپەرستی و نەتەوەپەرستی) یەوە زیان بە بیری ئومەت بگەیەنن وەستاوەتەوە، نووسینی لە دژیان نووسیوە».[٢٢]

ئەحمەد نەعیم ئاماژەی بەوە کردووە ئەگەرچی لە مەبەستەکەشیان بێئاگابین، هەست بەوە دەکەین براعەرەبەکانماندا کەتوونەتە شوێن بانگەشەی (ڕەگەزی-نەتەوە)یی، هەرچی لەناو برا تورکەکانیشە لەژێر دروشمی( تورکچێتی) تەوژمی ڕەگەزپەرستی و نەتەوەچێتی سەریهەڵداوە و لەبەرئەوەی لەگەڵ ئەماندا بەریەککەوتنی زیاترمان هەیە گومان دەبەم زیاتر ئاگاداری ئەم تەوژمە بین. هەرچی سەبارەت بە براکوردەکانمانە-بەگوێرەی تێگەیشتنی من- تاوەکو ئێستا تووشی ئەو نەخۆشییە نەبوون، داواکارم لەخودای باڵادەست تووش نەبن.[٢٣]

**لە سەردەمی بابانزادە ئەحمەد نەعیمدا، بابەتی ڕەگەزپەرستی و نەتەوەپەرستی بووە ڕۆژەڤی ناوەندی کولتووریی و سیاسی، بەڕادەیەك ڕەگەزپەرستی و تورکچێتی وەکو تەوژمێکی فیکری ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بڵاوبووەتەوە، بابانزادە ئەو تەوژمەی بەتوندی ڕەتدەکردەوە**

ئەحمەد نەعیم سەرەتا لە وتارێکیدا لەژێر ناوی»ڕەخنە لە کۆمەڵەی یەکێتی عەرەب، ئامۆژگارییەکمان بۆ برا عەرەبەکانمان» ڕەخنەی لە عەرەبەکان گرتووە و بە یارمەتی تێکست و سەرچاوە ئیسلامییەکان هەوڵی ئاگادارکردنەوەیانی لە مەترسی نەتەوەپەرستی داوە. لەلایەکی ترەوە ئەحمەد نەعیم لەدوای ئەو

22 Babnzade Ahmet Naim, İslam’da Irkçılık ve Milliyeçilik davası’, hazırlayan: Farhrettin Gün,bayan yaynyayinları,( istanbul _2018), kitabının sonüşü, s.17.

23 Babanzâde Ahmed Naim, İslam’da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s.49-50

نووسینانەی و یانزە ساڵ دواتر واتا لە ساڵی ١٩١٤ لە پێش هەموویانەوە بۆ ڕەخنەگرتن لە پێشڕەوی تەوژمی تورکچێتی زیاء گۆیک ئالپ وتارێکی درێژی لەژێر ناوی» بانگەشەی قەومییەت لە ئیسلامدا» نووسیوە و لە گۆڤاری (سبیل الرشاد)دا بڵاویکردووەتەوە، لە هەمان ساڵدا لەلایەن یەکێک لە بڵاوکراوەکانی گۆڤارەکە بەشێوەی نامیلکەیەک چاپکراوە، بەجۆرێک ئەو نامیلکە لە زۆر لایەنەوە خاوەن تایبەتمەندی و گرنگی خۆی بووە، بەڕادەیەک لە گرنگترین ئەو تێکستانە بووە کە زۆرترین مشتومڕی لەمەڕ پرسی نەتەوەچێتی لە سەردەمی دووەمی مەشرووتەدا دروستیکردووە.[٢٤]

ئەحمەد نەعیم لەو وتارەی لەسەرەوە باسکرا، بە پشتبەستن بە بنەماکانی ئیسلام (قورئان و فەرموودە) هەموو بانگەشەیەکی نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی ڕەتکردۆتەوە، بەگوێرەی بۆچوونی ناوبراو ئەو بانگەشە داهێنراو(بیدعە)یەکە هێنراوەتە ناو خاکی ئیسلام، لەهەمانکاتدا بڕوای وابوو نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی بانگەشەیەکی قەدەغە و یاساغە، خۆی گووتەنی:» لێرە لەناو مسوڵماناندا ئاشکراکردنی بانگەشەی نەتەوە و ڕەگەز پانزە بیست ساڵێکە سەریهەڵداوە و دوای مەشرووتەی دووەم کراوەتە بابەتێکی ژیانی و گرنگی مەملەکەت، ئەوەش بەهۆی نەزانین و جەهالەتمانەوە لە ئەوروپییەکانمان وەرگرتووە، کە بۆ بوون و مانەوەی ئیسلام بە ئەندازەی سەرەتان بیدعەیەکی بێگانەی کوشندەیە ...».[٢٥] هەر لەبەرئەوە زۆر بەتوندی بیر و بانگەشەی نەتەوەچێتی ڕەتکردووەتەوە و ڕەگەزپەرستی بە نەخۆشییەکی ڕۆژئاوایی داوەتەقەڵەم، لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەی بەوەکردووە ئەم دەردە کوشندە پەتایەکی زۆر زیانبەخشە، گەر ڕێی لێ نەگیرێت دەبێتە هۆی کوشتنی ئوممەتی ئیسلامی، چارەسەرکردنیشی کارێکی قورس و زەحمەتە.[٢٦]

بە باوەڕی ئەحمەد نەعیم، نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی نەک هەر کامەرانی و خۆشبەختی ناهێنێت، بەڵکو تراویلکەیەکی خەڵەتێنەرە (سەرابێکی موغفیلە)، ناوبراو لەمبارەیەوە درێژە بە بۆچوونەکەی دەدات دەڵێت: مادام بەگوێرەی یاسای سروشتی هۆکاری هاوشێوە ئەنجامی هاوشێوە دەهێنێتە کایەوە و بەرمەبنای ئەو

---

24 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s.17-**18**

25 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s.48

26 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s.49.

مەقولە، ئێمەش ئەگەر لەسەر هەمان ئەو ڕێگەیە بەردەوام بین، ئەوا ئەو بەڵا و کارەساتە گەورانەی بەسەر برا ئەلبانییەکانماندا هاتن بەسەر ئێمەشدا دێن.[٢٧]

ئەحمەد نەعیم، لە وتاری»بانگەشەی نەتەوەچێتی لە ئیسلامدا«، نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی بە شەربەتێکی ژەهراوی ناودەبات، بە باوەڕی ناوبراو ئەگەرچی عەسەبییەت چ بۆ ئایین بێت یان بۆ ڕەگەز شتێکی شیرینە، بەڵام ئەگەر ئیسلام یان هەر میللەتێک ئەو شەربەتە پڕ لە ژەهرە بنۆشێت هەرگیز بەختەوەریی و ڕزگاری نادۆزێتەوە.[٢٨]

ئەحمەد نەعیم بۆ پووچەڵکردنەوە و ڕەتدانەوەی بیانووەکانی بانگەشەکارانی نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی وەکو نموونە چەندین ئایەت و فەرموودەی پیرۆز پێشکەش دەکات، بەر لە هەرشتێک ئەو وەک ئیسلامخوازێک لەو باوەڕەدا بوو هیچ جیاوازییەک لە نێوان مسوڵمانانندا نییە، باوەڕی وابوو بەبێ لەبەرچاوگرتنی جیاوازی ڕەگەز، ڕەنگ و زمان هەموو مسوڵمانان بران، هەر لێرەشەوە ڕەتکردنەوەی بانگەشەی بانگەشەکارانی نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی دەستپێدەکات. بۆ ئەم مەبەستەش ئایەتی ژمارە (١٠) لە سورەتی (الحجرات): «انما المؤمنون اخوة « دەهێنێتەوە و بەمجۆر شرۆڤەی دەکات:» بەگوێرەی ئەم بنەما گەورە و سەرنجڕاکێشە هەموو ئەو باوەڕدارانەی دێنە ژێر ئاڵای یەکتاپەرستی و دان بە پێغەمبەرایەتی(رسول اکرم) پێغەمبەر(د. خ)دا دەنێن برای یەکترن و ئەم برایەتی ئاینییەش لە فەرموودەیەکدا کە حەزرەتی ئەنەس گێڕاویەتییەوە بە ئاشکرا دیارە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی: «لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه»، واتا هیچ کەسێک لە ئێوە باوەڕی تەواو نابێت، تاوەکو چی بۆ خۆی پێشخۆشە بۆ برا ئاینییەکەشی پێیخۆش نەبێت.»[٢٩]

لێرە بە دواوە جەخت لە بنەماکانی دیکەی گەلانی ئیسلامی دەکاتەوە، بەجۆرێک بە بڕوای ئەو خەمی هەرە گەورەی مسوڵمانێک دایک، باوک و برای خوێنییەکانی نییە، بەڵکو دەبێت خەمی برای ئایینی و کۆمەڵەی ئیسلامی بێت، هەروەها چەندین فەرموودەی پیرۆز لەبارەی کۆمەڵەوە هێناوەتەوە:

---

27 (Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s.59.

28 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s.79.

29 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s. 72-73





- إن الله لا يجمع أمتي على ضلالة، ويد الله مع الجماعة، ومن شذ شذ إلى النار
- الجماعة رحمة، والفرقة عذاب
- من فرق فليس منا[30]

ئەمانە و چەند فەرموودەیەکی تری پیرۆزی لەبارەی بایەخ و گرنگیدانی ئیسلام بە کۆمەڵ و دورکەوتنەوە لە پەرتەوازەیی بەنموونە هێناوەتەوە.

شایەنی باسە ئەحمەد نەعیم وەک ئومەتچییەک، زۆر بەتوندی دژی هەموو تەوژمێکی نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی لەنێویشیاندا بیری تورکچێتی بووە، ناوبراو تورکچێتی دابەشی سەر دوو گرووپی (تورکچییە پەتییەکان) و (تورکچییە- ئیسلامچی)ییەکانی کردووە، ئەم دوو گرووپە تورکچییەی بەمشێوە ڕوونکردووەتەوە: « ئێمە تەنها دەتوانین لەگەڵ تورکچییە- ئیسلامچییەکاندا دەردەدڵ بکەین، چونکە لەگەڵ ئەمانەدا و لەچوارچێوەی ئیسلامدا هەم ڕێکەوتن و هەمیش تێگەیاندنیان لە بنەما حەقیقییەکانی ئیسلام ئاسانتر دەبینم.»[31]

بەم جۆرە ئەحمەد نەعیم ڕووی دەم دەکاتە ئەو گرووپە و دەڵێت: «بەڵام هەمیشە... - بەڵێ ئەمەتان هەرگیز بیر نەچێت- هەمیشە لەبری ئەوە بە «ئەی تورک» یەکتری بانگ بکەن، بە «ئەی مسوڵمان» یەکتر بانگ بکەن، باسی تورکچێتی مەکەن، هەرکاتێک ویستان تێبکۆشن بەناوی تورکچێتییەوە نا بەناوی مسوڵمانێتییەوە تیبکۆشن، مێژووی تورک لە مێژووی ئیسلام جیامەکەنەوە.»[32]

ئەحمەد نەعیم لە جێگەیەکی تری دانراوەکەیدا، ڕووی دەمی دەکاتە بانگەشەکارانی تورکچێتی بەمشێوە بانگەوازیان دەکات:» بۆ خاتری خودا واز لە وەرگێڕانی ڕووی تورکەکان لە کەعبەوە بۆ تۆران بهێنن، داوا مەکەن لە هیچ کەسێک ڕوو لە هەردوو لا بکات(هەم کەعبە و هەم تۆران)، چونکە ئەو دوو لا پێچەوانە و دژی یەکترن و لە یەککاتدا هەردووکیان نابینرێن، تورکەکان وەک هەزارساڵی پێشوو یان دەبێت ڕووبکەنە کەعبە و تۆران لە پشتیانەوە جێبهێڵن یان ڕوودەکەن تۆران و کەعبە لە بیر دەکەن...»[33] . لەبارەی ئەم بابەتەوە دیسانەوە ئەحمەد نەعیم لە

---

30 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s. 74-80

31 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s. 56.

32 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s. 60

33 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s. 66

جێگەیەکی دیکەی بەرهەمەکەیدا داوا لە بانگەشەکارانی تورکچێتی دەکات واز لە کۆکردنەوە دژەکان و خەیاڵی خاو و جووت ئایدیاڵی بهێنن.[٣٤]

ناوبراو لەم داواکارییانەی بەردەوام دەبێت، لەوەش زیاتر ئیسلامییە-تورکچییەکان بەمشێوە ئاگادار دەکاتەوە: «تەنها ئاگادار بن، ڕێنمویکردن و خزمەتاکانتان با بەناوی تورکچێتییەوە نەبێت و بەناوی مسوڵمانبوونەوە بێت، با لە گوتارەکاتاندا لە جێگەی (تورکەکان) هەمیشە (مسوڵمانەکان) بەکاربهێنن».[٣٥]

بەمجۆرە هەموو هەوڵی خۆی دەخاتەگەڕ بۆ ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵگەی ئەوکاتی عوسمانی بەگشتی و بانگەشەکارانی بیری تورکچێتی و ڕەگەزپەرستی لە زیان و خراپییەکانی ئەو تەوژمە هزرییە بۆ سەر کۆمەڵگە.

## ئەنجام

پێش هەموو شتێک بابانزادە ئەحمەد نەعیم مسوڵمانێکی پاک و ڕاستگۆ و نموونەی ئاییندارێکی ڕاستەقینە بووە. هەمیشە ئەولەویەتی بە ئیسلام و کۆمەڵی ئیسلامی داوە، بەجۆرێک تا کۆتایی تەمەنی وەفادار بووە بۆ ڕێبازی ئیسلام، چونکە ناوبراو بڕیاریدابوو هەموو ژیانی خۆی لەپێناو بەرژەوەندی ئیسلام و مسوڵمانان بەخت بکات. هەر لەم سۆنگەیەوە بووە کە دوا پڕۆژەی بابانزادە پڕۆژەیەکی ئایینی بووە. واتە؛ هەرچەندە لە ڕۆژانی کۆتایی ژیانیدا تووشی چەندین نەخۆشی ببوو، بەڵام بەردەوام بووە لە وەرگێڕانی سەحیحی بوخاری بۆ زمانی تورکی. هەروەها دواکردەوەی ژیانیشی سوجدە بردن بووە بۆ خودای تاقانە، وەک دەزانین کە بابانزادە لەکاتی ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆدا و لەکاتی سوجدەدا کۆچی دوایی کردووە.

هەروەک ئەحمەد نەعیم یەکێکە لە سیما هەرە دیارەکان و کەسایەتییە گرنگەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی و کولتووریی دوا قۆناغی دەوڵەتی عوسمانی، ناوبراو کەسایەتییەکی فرەڕەهەند بووە، چونکە ئەو لەیەککاتدا بیرمەندێکی جددیی و گەورە، مامۆستا و نووسەر و وەرگێڕ و ڕۆژنامەنووس و زمانزانیش بووە. جێ

34 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s. 68

35 Babanzâde Ahmed Naim, İslam'da Irkçılık ve Milliyeçilik davası, s. 70

پەنجەی خۆشی بەسەر هەریەک لەوکایانەوە جێهێشتووە.

باوەڕی بە بیرۆکەی ئومەتی ئیسلامی هەبوو، بەتوندی هەموو بەنگەشەیەکی نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی ڕەتدەکردەوە، چونکە بە بڕوای ئەو هەموو مسوڵمانان لەچوارچێوەی ئایینی ئیسلامدا برای یەکترن. هەروەک بیری نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی بەڵایەکی ترسناکن! هەڕەشە لە کۆمەڵگەی ئیسلامی و یەکگرتوویی مسوڵمانان دەکەن.

نەتەوەچێتی و ڕەگەزپەرستی بووەتە بابەتی گەرمی ناو ناوەندی ڕۆشنبیریی و سیاسی سەردەمی ئەحمەد نەعیم، بەجۆرێک تورکچێتی و ڕەگەزپەرستی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ وەک بزووتنەوەیەکی بیرکردنەوە لە تەشەنەکردندا بووە، هەر بەم هۆیەشەوە ئەحمەد نەعیم زۆر بە توندی ڕەگەزپەرستی ڕەتکردووەتەوە و ئەم بزووتنەوە فیکرەییەی قبوڵ نەکردووە و کەوتووەتە ململانێیەکی توند و درێژخایەن لەگەڵ ئەو کەسانەی بانگەشەی تورکچێتی و ڕەگەزپەرستییان کردووە، بەردەوام لە مشتومڕێکی سەختدا بووە لەگەڵ سەرانی بزوتنەوەی تورکچێتی و ڕەگەزپەرستیدا، بەجۆرێک مشتومڕەکانی بەتایبەت لەگەڵ ئەحمەد ئاغائۆغلو، زیا گۆک ئالپ، فوئاد کۆپرولو و یەحیا کەمال لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی سەردەمی خۆیدا بڵاوکراوەتەوە. وتارەکەی لەسەر ئەم بابەتە بەناونیشانی «بانگەشەی نەتەوەچێتی لە ئیسلامدا» یەکێکە لە بەرهەمە گرنگەکانی ناوەندی ڕۆشنبیری عوسمانی ئەو ڕۆژگارە.

## سەرچاوەکان


1. Babanzâde Ahmed Naim. İslam'da Irkçılık ve Milliyetçilik Davası, hazırlayan: Fahrettin Gün, Beyan Yayınları, İstanbul 2018.
2. . İslam Ahlakının Esasları, notlar ilave ederek sadeleştiren Prof. Dr. Recep Kılıç, Türkiye Diyanet Vakfı, 2 basık, Ankara 2014.
3. Bahadır Şah I, Türk Meşhurları, Baban, earşiv.şehir.edu.tr.
4. Fahrettin Gün. Müderris Babanzâde Ahmed Naim, Beyan Yayınları, İstanbul 2016.
5. Fatma Yıldız. Babanzâde Ahmed Naim'in "İlmü'n-Nefs" Adlı Eserinin Tahlili Ve Çeviri Yazısı, Yüksek Lisans Tezi, İstanbul Üniversitesi 2014.

6. Hilmi Ziya Ülken. Türkiye'de Çağdaş Düşünce Tarihi, Türkiye İş Bankası Kültür Yayınları, İstanbul 2019.
7. Hüseyin Hansu. Secdede Biten Bir Ömür: Babanzâde Ahmed Naim Bey, DİN VE HAYAT. EKIM 2015.
8. . Secdede Biten Bir Ömür: Babanzâde Ahmed Naim, Kaynak Yayınları.
9. İsmail L. Çakan. Babanzâde Ahmed Naim1872-1934; Müderris, mütercim, fikir adamı ve yazar, TDV İSLAM ANSİKLOPİDESİ org.tr.
10. Jabar Kadir. Babanzâde Ahmed Naim 1873-1934(Kürtçe). www.WtariKurd.info.
11. M. Cevdet İnançalp. Müderris Ahmed Naim, İstanbul, Ülkü Matbaası, 1935.
12. M. Cüneyt Kaya – İsmail Kara. Babanzâde Ahned Naim Bey'in Hayatı ve Eserleri, İstanbul Ağustos 2018.
13. M. Şükrü Hanioğlu. Türkçülük; XIX Yüzyılda Osmanlı Devletlerinde Entelektüel Düzeyde Başlayan, Daha Sonra Siyasal ve İdeolojik Boyut Kazanan Hareket, Pantürkizim. İslam Ansiklopedİsi.org.tr.
14. Şengül Özoğul. Babanzâde Ahmed Naim'in Felsefe Algısı ve Ele Aldığı Felsefi Problemler, Yüksek Lisans Tezi, Necmettin Erbakan Üniversitesi 2016.
15. Yusuf Akçura. Üç Tarz-ı Siyaset, Türk Tarih Kurumu, 8. baskı, Ankara 2018.








عادل صدیق عەلی

# ڕەنگدانەوەی ڕەوشی خوێندن لە کوردستان لە یاداشت و بیرەوەرییەکانی نێوان ساڵانی

## (١٩١٤-١٩٩١)

مێژوونووسان بۆ نووسینەوەی مێژوو کەڵك لە سەرچاوەی جۆراوجۆر وەردەگرن، یەکێك لەو سەرچاوانە یاداشت و بیرەوەرییەکانن، بەوپێیەی لە سەرچاوە ڕەسەن و یەکەمینەکان، بۆ نووسینەوەی مێژوو دێنە هەژمار.

بەهای مێژوویی ئەم جۆرە سەرچاوانە لەوەدایە، کە نووسەرەکانیان هاوسەردەمی ڕووداوەکانن، ئەوەش گرنگی مێژوویی ئەو سەرچاوانە بۆ مێژوونووسان پتر دەکات. ڕەنگە گرنگییەکی تری ئەمجۆرە سەرچاوانە لەوەوە هاتبێت، زۆرجار نووسەرانی ئەم کەرەستە خاوەی مێژوو، بەهۆی شارەزاییانەوە لە هونەری گێڕانەوە باشتر لە مێژوونووسان توانیویانە وێنای ڕووداو و گۆڕانکارییەکان بکەن و واقیعەکە بە نزیکەیی وەک ئەوەی ڕوویداوە بگێڕنەوە.

لەلایەکی دیکەوە، ئەو جۆرە نووسینانە ڕۆڵێکی چارەنووسساز لە نووسینی مێژوودا دەگێڕن، چونکە بیرەوەرییەکان دیدێکی کەسی ناوازە سەبارەت بە گۆڕانکارییە مێژووییەکان پێشکەشدەکەن. ئەوان دیدگای ورد بۆ بیرکردنەوە و هەست و ئەزموونی ئەو تاکانە دەخەنەڕوو، کە لە ساتەوەختە تایبەتەکانی مێژوودا ژیاون. زۆرجار ڕۆشنایی دەخەنە سەر ئەزموونی ئەو تاکانەی، کە چیرۆکەکانیان لە ڕێگەی سەرچاوە مێژووییە فەرمییەکانەوە تۆمار نەکراوە. زەمینەیەکی گرنگیش بۆ ڕووداوە مێژووییەکان پێشکەشدەکەن، کە بە وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانە و پێوەرە کولتووریی و بەها کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمە ئاشنامان دەکەن.

بەکورتی، یاداشت و بیرەوەرییەکان دەتوانن تەواوکەری سەرچاوە مێژووییەکانی تر بن، وەک بەڵگەنامەی فەرمی و ڕۆژنامە و توێژینەوە ئەکادیمییەکان. ئەوان (دیدێکی کەسیی) تر و زۆرجار وردتر لە ڕووداوەکان پێشکەش دەکەن، کە دەتوانن گێڕانەوەی مێژوویی دەوڵەمەند بکەن. هەموو ئەو هۆکارانە وایان کردووە ئەمڕۆ مێژوونووسان وەک سەرچاوەیەکی گرنگ و پڕ بایەخ لەمجۆرە نووسینانە بۆ نووسینەوەی مێژوو بڕوانن و کەڵکیان لێوەربگرن.

بەشێک لە نووسەرانی یاداشت و بیرەوەری ئەو قۆناغەی کە لە ناونیشانەکەدا هاتووە، بەتایبەتی ئەوانەیان، کە نووسینەکانیان لە شێوەی ژیاننامەی خودیدان، لە باسی قۆناغی منداڵی خۆیاندا بەکورتی ئاماژەیان بە بارودۆخی خوێندن لەو شار و ناوچانەی، کە لێی ژیاون و خوێندوویانە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیست کردووە. خوێندنیش لە کوردستاندا دوو جۆر بووە، خوێندنی ئایینی و خوێندنی میریی.

## یەکەم: خوێندنی ئاینی:

لە دوای گەیشتنی ئاینی ئیسلام بە کوردستان و مسوڵمانبوونی کورد، شانبەشانی گەلە مسوڵمانەکانی تری جیهانی ئیسلامی، کورد خزمەتێکی گەورەی بە شارستانییەتی ئیسلامی کردووە. سەدان گەورە زانای لە بوارە جیاوازەکاندا پێشکەشی ئەو شارستانییەتە کردووە. گەورە و ئاغا و میرەکانی کورد و خەڵکانی جوتیار و کاسبکار چەندیان لەدەست هاتبێت، بۆ دروستکردنی مزگەوت و حوجرە و ژیاندنی فەقێ کەمتەرخەمییان نەکردووە. جگە لە شارەکان، کەم گوندی کوردستان هەبووە مزگەوتی لێ نەبووبێت، بەدەگمەن گەورە گوندێکی کوردستان هەبووە مەلایەک و کۆمەڵێک فەقێی لێ نەبووبێت. بۆ بەڕێوەبردنی مزگەوت و حوجرە ئاینییەکان، هەزاران گوند و پارچە زەویی و باخ و ئاشی ئاو ... هتد لەسەر مزگەوت و حوجرە و مەلا وەقف کراوە. زۆرێک لەو مەدرەسە ئاینییانە خاوەنی کتێبخانەی خۆیان بوون، ئەو کتێبخانانە ژمارەیەکی زۆر کتێبی دەستنووس و چاپکراوی هەمەجۆریان تێدا بووە.[١]

بەدرێژایی سەدان ساڵ و بەر لە کردنەوەی قوتابخانە لە کوردستان، لە کوردەواریدا تەنها خوێندنی ئاینی هەبووە، خوێندنەکەش زۆرتر لەنێو حوجرەکانی مزگەوت و هەندێک جاریش لە ماڵاندا بووە. ئەوانەی لەم بوارەدا خوێندوویانە زۆرتر بە فەقێ ناسرا بوون. ئەگەرچی هەر قۆناغێکی خوێندنەکە ناوی تایبەتی خۆی هەبووە، لەنێو ئەمانەدا گەلێک زانای گەورە هەڵکەوتوون، ئەمانە وەک عەلادین سەجادی ئاماژەی بۆ کردووە، چرای خوێندەوارییان بەدەستەوە بووە و بەهۆی زانستەکەیانەوە بوون بە هۆکارێک، کە بێگانە کورد بناسێت.[٢]

هەندێک لە یاداشت و بیرەوەرینووسەکان بەو کەمە زانیارییەی، کە لەبارەی خوێندنی ئاینییەوە خستوویانە ڕوو، وێنایەکی وردی ژیانی فەقێیەتییان لە کوردستان نیشانداوە.[٣] ئەوەی لە هەمووان زیاتر، تەنانەت تەواوی بیرەوەرییەکانی

---

١ مەلا محەمەدی چرۆستانی: یادداشتەکانی مناڵی و بەشێکی سەردەمی فەقێیەتی مامۆستا مەلا محەمەدی چرۆستانی، ساغکردنەوە و پێشکەشکردنی محەمەدی مەلاکەریم، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٤، ل٥١
کەمال ڕەئوف محەمەد(بابی لالۆ): ئەدەبی نامەنووسینی کوردی، جزمی سێیەم، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٣٠-٣١.

٢ عەلادین سەجادی: گەشتێک لە کوردستانا، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٥٦، ل١٣٩ ؛ مەولود بێخاڵی: هەولێرم وادیوە، بەرگی یەکەم، دەزگای ڕۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٩١، ل٦٦.

٣ بڕوانە: مەلا محەمەدی چرۆستانی: س.پ ؛ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، ئامادەکردنی سدیق

بۆ باسکردنی ئەم بوارە تەرخانکردووە، مەلا محەمەدی چرۆستانییە، محەمەدی مەلا کەریم لەبارەی نرخی مێژوویی یاداشتەکەیەوە، دەڵێت: "یاداشتەکانی مامۆستا نرخێکی زۆری بۆ گەلێ سەری ژیانی کولتووریمان هەیە. تابلۆیەکی چڕی ژیانی فەقێیەتی و ژیانی کۆمەڵایەتی لادێکان و جۆری بیرکردنەوەی خەڵکی ئەو سەردەمەیە".[٤] مەلا محەمەد لە ڕێگەی ئەم نووسینەیەوە وێنەیەکی ڕوونی ئەو هەلومەرجە ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەی ژیانی فەقێکانی کوردستانی کێشاوە. بەوپێیەی، کە مەلازادە بووە، باوکی زۆر شوێن و جێگا گەڕاوە و کاری مەلایەتی تێدا کردووە و فەقێی ڕاگرتووە. دواتر، کە خۆشی بووە بە فەقێ، بەمەبەستی درێژەدان بە خوێندن سەری لە زۆر مەڵبەند و ناوچەی کوردستان داوە، ئەوەش وایکردووە زانیاری ورد و باشی لەسەر ژیانی فەقێ و حوجرە هەبێت.[٥]

ئەو منداڵانەی دەخرانە بەر خوێندنی ئایینی، زۆرتر لە تەمەنی (٦-٧) ساڵیدا دەبرانە لای مەلا جا لە مزگەوت بووبێت، یاخود لە ماڵەوە، بۆئەوەی فێری خوێندن و نووسینیان بکەن،[٦] چونکە جگە لە مزگەوت بەشێک لە مامۆستایان لەنێو ماڵەکانیاندا سوختەیان ڕاگرتبوو.[٧] ئەوانەش، کە لە قوتابخانە خوێندوویانە، کەسوکاریان بەر لە چوونە قوتابخانە یان لەکاتی پشووی هاوینی قوتابخانەکاندا بردوونیانەتە لای مەلای مزگەوت و پێیان خوێندوون.[٨]

---

سالح، چاپخانەی شڤان، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٧١، ٩٤-٩٦ ؛ عەلادین سەجادی: گەشتێک لە کوردستانا، ل١٣٨-١٣٩ ؛ مەلا عەبدوڵڵای زێوەر: گەنجینەی مەردان و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، چاپخانەی (شرکة مطبعة الادیب البغدادیة) بەغدا، ١٩٨٥ ؛ عەبدولخالق عەلادین: س.پ، ل٢٨ ؛ مەلا عەوڵای حاجی سمایل: سەربردەی ژیانی سیاسیم، مطبعة الادیب البغدادیة المحدودة، بەغداد، ١٩٩٠، ل٧-١١ ؛ ئەحمەد دڵزار: بیرەوەری ڕۆژانی ژیانم، بەشی یەکەم و دووەم، وەشانخانەی سارا، ستۆکهۆڵم، ١٩٩١، ل١٠-١٢ ؛ هادی ڕەشید چاوشلی: هەولێر لەگەڵ کاروانی فەلەک، چاپخانەی (الجاحظ)، بەغدا، ١٩٨٧، ل٢٤.

٤ مەلا محەمەدی چرۆستانی: س.پ، ل٤-٥.

٥ ه.س.

٦ هادی ڕەشید چاوشلی: هەولێر لەگەڵ کاروانی فەلەک، ل٢٤.

٧ مەولود بێخاڵی: س.پ، ل٦٧.

٨ بڕوانە: محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، ل٣٢ ، ٧١ ؛ عەبدولخالق عەلادین: دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، دار افاق عربیة للصحافة والنشر، بغداد، ١٩٨٥، ل٢٨ ؛ ئەحمەد دڵزار: س.پ، بەشی یەکەم و دووەم، ل١٠-١٢ ؛ مەلا عەبدوڵڵای حاجی سمایل: س.پ، ل٧.

فەقێ لە سەرەتادا قورئان و سەرەتایەکی خوێندنی زمانی عەرەبی و زمان و ئەدەبیاتی فارسی خوێندووە، دواتر لەگەڵ تێپەڕینی قۆناغەکانی خوێندن (قوتابی، سوختە، فەقێ، موستەعید) ئەو کتێبانەی دەخوێند، کە پێویست بوو لە هەر قۆناغێک بخوێنرێت. ماوەی خوێندنیش لە نێوان (١٠-١٥) ساڵدا بووە، دوای تەواوکردنی هەموو پێداویستییەکانی خوێندن، مۆڵەتی مەلایەتی بەو کەسە دراوە.[٩] محەمەد ڕەسوڵ هاوار یەکێکە لەو کەسانەی، کە لە تەمەنی (٦-٧) ساڵیدا باوکی بردوویەتی بۆ لای مامۆستای مزگەوتی هەمزە ئاغای سلێمانی، ماوەی دوو ساڵ لەو حوجرەیە خوێندوویەتی، جگە لە قورئان، سەرەتایەکی زمانی فارسیش فێر بووە، دواتر چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی (فەیسەڵییە).[١٠] دڵداریش بە هەمان چەشنی هاوار بەر لە چوونە قوتابخانە، لەلای چەند مەلایەکی کۆیە کاری فەقێیەتی کردووە، بەپێی گێڕانەوەکانی خۆی قورئانی تەواو کردووە، پاشان چووەتە قوتابخانە.[١١] بەپێچەوانەوە، مەلا عەبدوڵڵای زێوەر، دوای تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی، بووە بە فەقێ، ماوەی ١٥ ساڵ بە شار و ناوچەکانی باشوور و خۆرهەڵاتی کوردستاندا گەڕاوە، هەتا هەموو زانستەکانی خوێندووە و مۆڵەتی مەلایەتی وەرگرتووە. لەوە بەدوا ماوەی (٤-٥) ساڵ کاری مەلایەتی کردووە و فەقێی ڕاگرتووە، بەڵام دوای گەڕانەوەی لە ئاوارەییەکەی، واتە پاش شکستی شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحمود، کراوە بە مامۆستا و لە ساڵی ١٩٣٨ خانەنشین کراوە.[١٢]

لەڕووی ژیان و گوزەرانەوە، فەقێ بەو دەقنە(ڕاتبە)[١٣] ژیاوە، کە لە خەڵکی

---

٩ گەشتێک لە کوردستانا، ل١٣٤-١٣٥ ؛ کەمال ڕەئووف محەمەد(بابی لالۆ): ئەدەبی نامەنووسینی کوردی، جزمی یەک، ل٢٥-٢٨.

١٠ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، ل٧١.

١١ عەبدولخالق عەلادین: س.پ، ل١١-١٢.

١٢ گەنجینەی مەردان، ل١٢.

١٣وشەی ڕاتبە عەرەبییە و بەمانای مووچە دێت، بەمەبەستی دابینکردنی خواردنی ڕۆژانە هەموو ئێوارەیەک یەک یان دوو فەقێی حوجرەکان کە زۆرتر سوختەکان ئەو کارەیان کردووە ڕادەسپێردران بەنێو ماڵەکانی نزیک مزگەوت یان ماڵەکانی گونددا بگەڕێن، هەر ماڵێک بەپێی توانای خۆی لە خواردن و پێداویستی ڕۆژانە بڕێک هاوکاری دەکردن، هەندێک خەڵکیش لەبری خواردن پارەیان داوە، ڕاتبەش سێ جۆر بووە: ڕاتبەی ڕۆژانە، ڕاتبەی بەهارە، ڕاتبەی هاوینە. بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەیەوە بڕوانە: مەلا ئەحمەد عەبدولڕەحمان سیامەنسووری: باسێک دەربارەی ڕاتبەی فەقێ لە ناوچەکانی کوردستان، گ(ڕەنگین)، ژ(١٥٨)، ٢٠٠٠، ل١٢-١٣ ؛ محەمەدی مەلاکەریم: لاپەڕەیەک لە خەباتی فەقێکانی کوردستان، گ(بەیان)، ژ(٢)، ئەیلوولی ١٩٧٢، ل١٨-١٩ ؛ محەمەدی مەلاکەریم: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستانی جاراندا،

گوندەکان کۆکراوەتەوە، ئەگەر حوجرەکە لە گوند، یان لە شاریش بووبێت لە ماڵەکانی دەوروبەری مزگەوت کۆکراوەتەوە. بەهۆی دەستکورتی و هەژارییانەوە، فەقێ پارەی کتێب و کاغەز کڕینی زۆر کەم بووە، هەر لەبەرئەوە بەزۆریی لە نووسراوی دەستخەتدا خوێندوویانە.[١٤] ڕاستە بەشێک لە حوجرە و مەدرەسەکان لەلایەن دەوڵەتەوە هاوکاری کراون، بەڵام زۆربەیان لەلایەن خەڵکانێکی دەوڵەمەند و توانادار پێداویستییەکانی ڕۆژانەیان بۆ دابینکراوە.[١٥] بەپێی گێڕانەوەکانی مەلا عەبدوڵڵای زێوەر، کەسێکی وەک مەحمود پاشای جاف(١٨٤٦-١٩٢١) هەر لە قزرابات(سەعدییە)وە هەتا مەریوان، هەموو ئەو گوندانەی، کە قەڵەمڕەوی عەشیرەتی جاف بوون، مووچەی بۆ مەلا و وەقف بۆ مزگەوتەکانیان دیاریکردووە، تەنانەت مووچەی بۆ زۆرێک لە مەلا و (مودەڕیس) و خەڵکانێکی لێقەوماوی ناو شاری سلێمانی بڕیوەتەوە. جگە لەم کارانەی، هەر شێخ و مەلا و دەروێش و هەژارێک ڕووی لێ نابێت، نائومێدی نەکردووە.[١٦] زێوەر لە درێژەی گێڕانەوەکانیدا، دەڵێت "ئیحسان و خێراتی مەحمود پاشا زۆرە، لە گەرمیان و کەلار، دەککە، قەرەداغ، تەکیە، لە زۆر جێگای تر، مزگەوت و ئەوقافی هەیە، مەدرەسەیەکی لە قزرابات دروستکردووە، وەک مەدرەسەکەی نیزامییەی نیزامولمولک ئەبێ، هەموو مانگێ چل لیرە زیاتر بۆ مەعاشی مودەڕریس و تەڵەبە و موئەزین و خادیم لە وەقفێ کە بۆی داناوە سەرف ئەکرێ. هەتا خۆی لە حەیاتا بوو، مونتەزەم ئەم مەعاشانە ئەدرا، لە پاش وەفاتی، نەوەکانی لەسەر ئەو هاوکارییە بەردەوام بوون".[١٧]

فەقێ وەک پێشتر باسکراوە، خوێندنەکەی زۆرتر بە زمانی عەرەبی و فارسی بووە و کەمتر زمانی کوردییان بەکارهێناوە. شاکر فەتاح(١٩٣٠) باسی ئەوەی کردووە، کە مەلا محەمەد ئەمین ناوێک لە مزگەوتی پێنجوێن (٢٢) فەقێی لە بەردەستدا بووە و بە زمانی فارسی پێی خوێندوون و حەزی لە زمانی کوردی

---

گ(بەیان)، ژ(٨)، ١٩٧٣، ل٥١-٥٢.

١٤ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، ل٩٦.

١٥ بڕوانە: مەلا محەمەدی چرۆستانی: ، ل١٩-٢٣، ٤٣ ؛ مەلا عەبدوڵڵای زێوەر: س.پ، ل٦٨، ٧٦-٧٧، ٨١، ١٠٠، ١٢٧، ١٨٠ ؛ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، ل٩٥ ؛ ئاکۆ شوانی: شاری سلێمانی(١٩١٨-١٩٣٢)، چ١، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٥٧.

١٦گەنجینەی مەردان و، ل٧٢.

١٧ه.س، ل٧٦-٧٧.

نەکردووە، تەنانەت پێی خۆش نەبووە، کە دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی (ئەلف و بێ)ی زمانی کوردی بۆ بنێرێت.[١٨] چارەکە سەدەیەک دواتر(١٩٥٥) عەلادین سەجادی سەرنجی ئەوەی داوە، کە فەقێکانی ناوچەی بادینان هیچیان دەربارەی هۆنراوە و ئەدەبیاتی کوردی نەزانیوە، لەکاتێکدا شارەزای ئەدەبی فارسی بوون، تەنانەت کاغەز نووسینیشیان بە زمانی عەرەبی بووە.[١٩] لەوەش زیاتر (موفتی ئامێدی) توانای نووسین و خوێندنەوەی بە زمانی کوردی نەبووە.[٢٠]

ئەگەرچی ژیانی فەقێ لە پاڵ خوێندنی زانستە شەرعییەکان، گاڵتەوگەپی شەوانە و شەڕە هۆنراوە و نابەناویش سەیران، بەتایبەتی لە وەرزی بەهار و سەردانیکردنی فەقێی مەدرەسەکانی تری بۆ لای یەکتر تێدا بووە،[٢١] لەگەڵ ئەوەشدا خوێندنی حوجرە، لەگەڵ کۆمەڵێک گرفت ڕووبەڕوو بوو، لەوانە دواکەوتوویی شێوازی خوێندن،[٢٢] جیاوازی زمان، گرانی ماددەکان، زۆری ماوەی خوێندن، نەشیاوی شوێنی خوێندن، هەژاریی و نەداریی، گرانی نان پەیداکردن، لێدان و سزای قورس،[٢٣] بەتایبەتی لە قۆناغەکانی قوتابی و سوختەییدا، بێگاری بۆ مامۆستا،

---

١٨ ئاوێنەی ژیانم (سەرجەم بەرهەمی شاکر فەتاح، کتێبی یەکەم)، ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٣، ل٦٩.

١٩ گەشتێک لە کوردستانا، ل٨٧.

٢٠ ه.س، ل٦٢.

٢١بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەیەوە بڕوانە: مەلا محەمەدی چرۆستانی: س.پ ؛ مەلا ئەحمەد عەبدولڕەحمان سیامەنسووری: باسێک دەربارەی ڕاتبەی فەقێ لە ناوچەکانی کوردستان، گ(ڕەنگین)، ژ(١٥٨)، ٢٠٠٠ ؛ محەمەدی مەلاکەریم: لاپەڕەیەک لە خەباتی فەقێکانی کوردستان، گ(بەیان)، ژ(٢)، ئەیلوولی ١٩٧٢ ؛ محەمەدی مەلاکەریم: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستاندا.

٢٢ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢، ل٥٧.

٢٣مەلا عەولای حاجی سمایل باسی ئەوەی کردووە کە ئەو هەر لە سەرەتاوە حەزی لە خوێندنی حوجرە نەبووە، کە لێدان و فەلاقەی مەلاشی بینیوە هێندەی دیکە لە خوێندنی حوجرە ترساوە، بەوهۆیەوە وازی لە خوێندنی حوجرە هێناوە. مەلا محەمەدی چرۆستانیش دەڵێت: "زۆر منداڵ بووم، لە ئابلاخ فەقێیەکی باوکم ... دەرسی پێ ئەگووتم، فەقێکە لێی دام، دەستم کرد بە گریان، بە کوڵی گریانەوە چووم بۆ ماڵی باوە گەورەم(حاجی مەلا محەمەدی باوکی دایکم)، پوورە فاتمەم(خوشکی دایکم) بەدەم گریانمەوە هات، فرمێسکەکانی چاومی سڕی و لاواندمییەوە، وتی: مەچۆرە لای فەقێیان، ئیتر خۆم درست پێ ئەڵێم. مەلا عەولای حاجی سمایل : س.پ، ل٨-٩ ؛ مەلا محەمەدی چرۆستانی: س.پ، ل٨.

کرێی خوێندن و دیاری[٢٤] بردن بۆ مامۆستا ... هتد.[٢٥] بۆ کەمکردنەوەی بەشێک لەو گرفتانە، محەمەد ئەمین زەکی و هاوەڵەکانی لە پەرلەمانی عێراق، وەک نوێنەرانی لیوای سلێمانی هەوڵیاندابوو، دوو دوو یان سێ سێ حوجرەکانی سلێمانی یەک بخەن، بۆئەوەی لەڕووی خوێندن و هاوکارییەوە یارمەتی بدرێن، بەڵام بەهۆی ڕێکنەکەوتنی حوجرەکان لەنێو خۆیاندا کارەکەیان سەرکەوتوو نەبووە.[٢٦]

هەموو ئەو کێشانەی سەرەوە وایکردبوو، ڕێژەیەکی کەمی ئەو منداڵانەی لە حوجرە دەیانخوێند، بتوانن هەتا کۆتایی درێژە بە خوێندن بدەن، زۆرینەیان پاش ماوەیەک لە خوێندن، کە فێری خوێندن و نووسین بوون وازیان لە خوێندن هێناوە، چونکە خوێندنی حوجرە هەتا وەرگرتنی مۆڵەتی مەلایەتی گران و ماوەکەی زۆر بووە، هەموو کەسێکیش ئەو پشوودرێژیی و توانایەی نەبووە.[٢٧] هەربۆیە لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی قوتابخانە میرییەکان و هۆشیاربوونەوەی خەڵکی و گۆڕانی بارودۆخی خوێندن و ئاستی ڕۆشنبیریی خەڵک، خوێندنی حوجرە ڕووی لە کزیی کرد و ڕێژەی فەقێ کەمبوویەوە، محەمەدی مەلا کەریم، کە یەکێک بووە لە فەقێکانی ئەو ڕۆژگارەی شاری سلێمانی، باس لەوە دەکات، ئەو ڕۆژانە ئەوان وەک فەقێکان زۆر بیریان لە ژیان و پاشەڕۆژی خۆیان کردووەتەوە و بە مایەی سەرشۆڕییان زانیوە، کە هەموو ئێوارانێک ماڵ بە ماڵ و ئاوایی بگەڕێن بۆ نان

---

٢٤ جگە لە کرێی مانگانە، دەبوو ناوبەناو دیاریش بۆ مامۆستا ببەن، بەنموونە هەندێک ئایەت کە سوختەکان پێی دەگەیشتن دەبوو پاداشت یان دیارییەک بۆ مامۆستا ببەن. مەولود بێخاڵی: س.پ، ل٧٠–٧١. مەلا عەوڵا باسی ئەوەی کردووە، کە جگە لە کرێی مانگانە، ئاوراکێشان بۆ ماڵی مامۆستا، ڕۆژانە قاپێک ماست و هەفتانە کەرە و تەنانەت ساڵانەش باوکی زەکاتی مەڕەکانی داوە بەو مامۆستایەی، کە ئەم لەلای خوێندوویە. بڕوانە: مەلا عەوڵای حاجی سمایل: س.پ، ل٨–٩.

٢٥ بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەوە بڕوانە: مەلا محەمەدی چڕۆستانی: س.پ ؛ عەبدولخالق عەلادین: س.پ، ل١١–١٢ ؛ ئەحمەد دڵزار: س.پ، ل١٠–١٢ ؛ مەلا عەوڵا حاجی سمایل: س.پ، ل٧–١١ ؛ مەولود بێخاڵی: س.پ، ل٦٨ ؛ محەمەدی مەلا کەریم: لاپەڕەیەک لە خەباتی فەقێکانی کوردستان، گ(بەیان)، ژ(٢)، ئەیلوولی ١٩٧٢، ل١٨–٢٠ ؛ محەمەدی مەلا کەریم: فەقێ و فەقێیایەتی لە کوردستانی جاراندا، گ(بەیان)، ژ(٨)، ١٩٧٣، ل٥١–٥٦ ؛ مەحمود عەزیز حەسەن: یادنامەکانی ژیان ژیانی فەقێ و دەنگی فەقێ، چ١، چاپخانەی شڤان، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٨ ؛ زەنون پیریادی: ژیانی فەقێیایەتی لە کوردستان، گ(ڕەنگین)، ژ(١٠٥)، ١٩٩٧/١٠/١٤، ل٢٢–٢٣ ؛ کەمال ڕەئووف محەمەد (بابی لالۆ): ئەدەبی نامەنووسینی کوردی، جزمی یەک، ل٢٥–٢٩.

٢٦محەمەد ئەمین زەکی: محاسەبەی نیابەت، ئامادەکردنی ئەحمەد حسەین، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢٠.

٢٧هادی ڕەشید چاوشلی: هەولێر لەگەڵ کاروانی فەلەک، ل٢٤.





و خواردن پەیداکردن و ژیانیان بەندبێت بە سەرفیترەی خەڵکەوە. دواتریش، کە بوون بە مەلا پاشەڕۆژێکی ئەوتۆیان نەبێت، سەرباری ئەوەش خوێندنەکەیان هیچ پەیوەندییەکی بە ژیانی سەردەمەوە نەبێت.[28] عەلادین سەجادی(١٩٥٥)یش کاتێک باسی ناوچەکانی بادینانی[29] کردووە، دەڵێت: "لەم وڵاتەدا فەقێ و مەلا دوایی هاتووە، لە هەموو ئەم وڵاتی بادینانەدا گەڕام، بڕوا ناکەم پەنجا فەقێیەک هەبووبێت، ئەوانەشی کە هەن لە کوردستانی تورکیاوە هاتوون، تەنانەت مەلا و شێخەکانیش کوڕی خۆیان ناخەنە بەر خوێندنی فەقێیەتی، هەموو چاویان لەوەیە منداڵەکانیان لە (مەکتەب) بخوێنن، نەک لەبەر خوێندن، بەڵکو لەبەر پارە و نان پەیداکردن". ئەوە لەکاتێکدا پێشتر لەنێو ئەو مەدرەسانەدا زانای گەورەی وەک مەلا حەسەنی زێباریی و مەلا مەحمودی ئامێدیی و مەلا یەحیای مزووری هەڵکەوتوون، بەڵام ئێستا شوێن ئاگردانیان چۆڵە.[30]

### دووەم: خوێندنی میری

خوێندنی میری لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا بە زمانی تورکی بوو،[31] بەهۆی گوێ پێنەدانی وەک پێویستی دەوڵەتی عوسمانی بە ڕەوشی خوێندن، ڕێژەی خوێندەواریی بەشێوەیەکی گشتی لە سەردەمەدا زۆر کەم بوو،[32] بەشێوەیەک کاتێک جەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی هات ڕێژەی خوێندەوار لە هەرسێ ویلایەتەکەی عێراق لە (١٪)ی دانیشتوانی تێپەڕی نەدەکرد.[33] زۆرجار یەکێک کاغەزێکی بۆ دەهات، ماڵ بە ماڵ و کۆڵان بە کۆڵان بە شوێن خوێندەوارێکدا دەگەڕا، کە کاغەزەکەی بۆ بخوێنێتەوە.[34]

دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بەهۆی ئەو هەلومەرجە نوێیەی، کە هاتە ئاراوە،

---

٢٨ محەمەدی مەلاکەریم: لاپەڕەیەک لە خەباتی فەقێکانی کوردستان، ل١٩.

٢٩ سەجادی باسی ئەوەی کردووە، کە خەڵکی ناوچەی بادینان بە هەردوو دەستییانەوە چوونەتە ژێر باڵی ئایین، وەنەبێ لەڕووی عیلمەوە بێ، بەڵکو زۆرتر لەڕووی بیستنەوەیە. گەشتێک لە کوردستانا، ل٨٨.

٣٠ گەشتێک لە کوردستانا، ل٨٨.

٣١ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢، ل٥٩.

٣٢ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، ل٩٧.

٣٣ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢، ل٦٦.

٣٤ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، ل٩٧.

خوێندن بە زمانی کوردی دەستپێکرد، بەڵام پرۆسەکە لە سەرەتادا ڕووبەڕووی کۆمەڵێک کێشە و گرفت بووەوە، لەوانە کەمی ڕێژەی قوتابخانە، نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی، کەمی ڕێژەی مامۆستا، گرفتی زمانی خوێندن و نەبوونی کتێبی کوردی، بەتایبەت ئەگەر ئەوە بزانرێت، کە زمانی کوردی وەک بەکارهێنان بەشێوەیەکی فەرمی لە سەرەتایدا بوو، ئەوەش وایکردبوو بناغەیەکی پتەوی نەبێت.[٣٥]

لیوای سلێمانی بەهۆی ڕووداوەکانی سالآنی جەنگی یەکەمی جیهانی و گرفتە ناوخۆییەکانەوە، یەکێک بوو لە لیوا دواکەوتووەکانی عێراق،[٣٦] محەمەد ئەمین زەکی کاتێک بوو بە نوێنەری لیواکە، لە پەڕلەمانی عێراق، سەرنجی ئەوەیدابوو، کە لەناو شاری سلێمانیدا تەنها یەک قوتابخانەی لێ بووە، ئەویش کەموکورتی زۆری هەبووە، هەربۆیە لە دوای ئاسایش و ئارامی گرنگترین بابەت بەلای ئەو و هاوەڵەکانییەوە، نەهێشتنی کەموکورتی قوتابخانە تاقانەکەی شار و کردنەوەی قوتابخانەی نوێ بووە، بەهۆی هەوڵەکانیانەوە هەتا کۆتایی خولی یەکەمی پەڕلەمان، ژمارەی قوتابخانەکانی ناو شار گەیشتە چوار قوتابخانە، دوانیان سەرەتایی کوڕان و یەکێکیان بۆ کچان[٣٧] و ئەوی دیکەیان ناوەندی بووە،[٣٨] تەنانەت بۆ کردنەوەی ناوەندییەکە خۆی چووبوویە سلێمانی و بەردی بناغەکەی دانابوو.[٣٩] جگە لەناو شاری سلێمانی، نوێنەرانی لیواکە هەوڵێکی زۆریاندا، بۆ کردنەوەی قوتابخانە لە شارەکانی هەڵەبجە و پێنجوێن[٤٠]

---

٣٥بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محەمەد ئەمین زەکی: محاسەبەی نیابەت، ل١٤-٢٢ ؛ محەمەد ئەمین زەکی: دوو تەقەلای بێ سوود، لێکۆڵینەوەی سەباحی عەلی غالب، چاپخانەی هەڵوێست، لەندەن، ١٩٨٤، ل٦٤-١١٤ ؛ مەریوان مەحمود محەمەد: خوێندنی کوردی لە ململانێی سیاسی نێوان کورد و دەوڵەتی عێراق(١٩٢١-١٩٥٨)، نامەی ماستەر بڵاونەکراوە، بەشی مێژووی زانکۆی کۆیە، ٢٠٢١.

٣٦ مەلا عەبدوڵڵای زێوەر: گەنجینەی مەردان و، ل١١١-١١٢.

٣٧عەبدولعەزیز یاملکی ئاماژەی بە ڕۆڵی ئەمین زەکی بەگ لە کردنەوەی ئەو قوتابخانەی کچاندا کردووە، ئەوەش دەرفەتی بۆ کچانی شارەکە ڕەخساندووە کە ئەوانیش شانبەشانی کوڕان بخوێنن، (گوزیدە خانم) ی خێزانیشی کراوە بە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە. بڕوانە: مذكراتي كشف القناع عن بعض الوقائع العراقية (١٩٢٣-١٩٥٨)، مطبعة ژین، السليمانية، ٢٠١٩، ل٤٣.

٣٨محەمەد ئەمین زەکی: محاسەبەی نیابەت، ل١٤-١٥.

٣٩ گەنجینەی مەردان و، ل١١١-١١٢.

٤٠شاکر فەتاح لە گەشتەکەی ساڵی ١٩٣٠ بۆ پێنجوێن، ئاماژەی بەوە کردووە، کە پێنجوێن قوتابخانەی میری لێ نییە، ئەوەی هەیە، تەنها مەدرەسەیەکی ئاینییە، کە لەلایەن مەلا محەمەد ئەمین ناوێکەوە بەڕێوەبراوە و ٢٢ فەقێی هەبووە، خوێندنەکەشیان لەسەر شێوازێکی زۆر کۆن بووە. ئاوێنەی ژیانم،

و قەرەداغ و تەوێڵە و بەرزنجە و چوارتا و چەند شوێنێکی دیکە.[٤١]

ناوەندییەکەی سلێمانی لە سەرەتادا تەنها پۆلی یەکەمی هەبووە، دواتر پۆلی دووەمیشی بۆ زیاد کراوە.[٤٢] بەر لە کردنەوەی ئەم قوتابخانانە، لە ڕێگەی داواکاریی و بەیاننامەوە، چەندین جار داوای کردنەوەی قوتابخانەیەکی سەرەتایی و یەکێکی ناوەندی لە سلێمانی کرابوو.[٤٣] ناوەندییەکە، جگەلەوەی هەتا چەند ساڵێک پۆلی سێیەمی نەبووە،[٤٤] بۆ هەندێک لە بابەتەکان مامۆستای کورد نەبووە،[٤٥] بەناچاری بۆ درێژەدان بەخوێندن، قوتابیان ڕوویان لە شارەکانی تر بەتایبەتی کەرکووک و بەغدا کردووە.[٤٦] ئەوانەیان، کە دەچوونە بەغدا بە هەوڵی محەمەد ئەمین زەکی لە دواناوەندی ئەو شارە وەردەگیران.[٤٧] مامۆستا ڕەشید کەریم باسی ئەوەی کردووە کاتێک خۆی و سێ لە هاوڕێکانی بەمەبەستی درێژەدان بە خوێندن چوونەتە بەغدا، محەمەد ئەمین زەکی ڕۆڵێکی بەرچاوی لە وەرگرتنیان لە پەیمانگای مامۆستایانی بەغدا بینیوە.[٤٨]

دواتر، کە محەمەد ئەمین زەکی بوو بە وەزیری مەعاریف هەوڵەکانی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی خوێندن لە لیوای سلێمانی زیاتر چڕکردەوە، بەڵام بەهۆی نەبوونی مامۆستای پێویست و پسپۆڕی کورد بۆ چەند بابەتێک نەتوانرا وەک پێویست کێشەکە چارەسەر بکرێت، بۆ چارەسەری ئەو گرفتە خۆی سەردانێکی سلێمانی کرد و لەگەڵ ڕۆشنبیران و پیاوماقوڵانی شار و کاربەدەستاندا کۆبوویەوە، بەشێوەیەکی کاتی کێشەکە بەوە چارەسەرکرا، کە ئەو چەند بابەتە بە زمانی عەرەبی و بابەتەکانی دیکە بە کوردی بخوێنرێن، بۆئەوەی ئەوە ببێتە

---

ل٦٣، ٦٩.

٤١ محەمەد ئەمین زەکی: محاسەبەی نیابەت، ل٢٠.

٤٢ ه.س، ل١٥.

٤٣ ئەحمەد خواجە: چیم دی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی مەزن، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٣، ل٥٧.

٤٤ نووری شاوەیس: لە بیرەوەرییەکانم، گ(پێشەنگ)، ژ(٢)، شوباتی ١٩٨٣، ل٩-١٠.

٤٥ محاسەبەی نیابەت، ل١٥.

٤٦ نووری شاوەیس: لە بیرەوەرییەکانم، گ (پێشەنگ)، ژ(٢)، ل١٠.

٤٧ محەمەد ئەمین زەکی: محاسەبەی نیابەت، ل١٥.

٤٨ مامۆستا ڕەشید کەریم: بیرەوەری (سی و یەک ساڵ لە ژیانی مامۆستایەک)، چاپخانەی ژین، ١٩٦٠، ل١١-١٢.





بەردی بناغەی خوێندنی کوردی لە داهاتوودا.[٤٩] بۆ چارەسەری زیاتری ئەو بابەتە، محەمەد ئەمین زەکی هانی ڕۆشنبیرانی کوردی داوە، کە گرنگی بە وەرگێڕانی کتێب بۆ زمانی کوردی بدەن، بەتایبەتی ئەو بابەتانەی، کە لە قۆناغەکانی خوێندندا دەخوێندران، ئەوەشی بە ئەرکی سەرشانی ڕۆشنبیرانی ئەو ڕۆژگارە زانیوە، پێیوابووە هەر جۆرە سستی نواندنێک لەو ڕووەوە کاریگەریی زۆر قورس و گرانی لەسەر پاشەڕۆژی کورد دەبێت.[٥٠]

هۆکاری ئەو هەموو گرنگیدانەی بە خوێندن و خوێندەواری لەوەوە هاتبوو، کە ناوبراو پێشکەوتنی کۆمەڵگەی بە خوێندنەوە بەستبوویەوە، سودی خوێندنیشی لەوەدا دەبینییەوە، کە خوێندکار هەموو قۆناغەکانی خوێندن تەواو بکات، خۆ ئەگەر وانەبێت خوێندکارانی کورد لە زۆر ماف بێ بەش دەبوون، بەتایبەتی لە پشکی ئەو خوێندکارانەی، کە ساڵانە دەنێردرانە ئەوروپا و ئەمریکا بەمەبەستی درێژەدان بەخوێندن، لەلایەکی ترەوە خوێندکاران بێ بەش دەبوون لە درێژەدان بە خوێندن لە خوێندنی باڵا لە بەغدا.[٥١]

جگە لە کەمی ڕێژەی قوتابخانەکان بە بەراورد بە زۆری ژمارەی دانیشتوان، لەو سەرەتایەوە، کە قوتابخانەکان لە قەزا و ناحیەکان و گوندە گەورەکان دەکرانەوە، خاوەنی خانووی تایبەت بە خۆیان و پێداویستییەکانی خوێندن نەبوون، بەڵکو زیاتر لە خانووی کرێدا بوون، کە هیچ مەرجێکی خوێندنی تێدا نەبووە ... هتد.[٥٢] لە شارێکی وەک هەڵەبجەدا، کە گەورەترین قەزای لیوای سلێمانی بوو، هەتا کۆتایی بیستەکانی سەدەی بیست، یەک قوتابخانەی کوڕانی تێدا بوو، ئەم قوتابخانەیە سەرەتا بە (ئەوەڵی هەڵەبجە) ناوبراوە و لە چوار پۆل پێکهاتبوو، ئەویش وەک تەواوی قوتابخانەکانی دیکەی کوردستان لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی وێران بووە و داخراوە. دوای جەنگ کە کراوەتەوە، تەنها سێ پۆل

---

٤٩محەمەد ئەمین زەکی: محاسەبەی نیابەت، ل١٩.

٥٠ه.س، ل٢١-٢٢ ؛ محەمەد ئەمین زەکی: دوو تەقەلای بێ سوود، ل١٠٧-١٠٨ ؛ شاکر فەتاح: خەباتی ڕۆشنبیران، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٤، ل٦٧-٦٨.

٥١محەمەد ئەمین زەکی: محاسەبەی نیابەت، ل١٩.

٥٢مامۆستا ڕەشید کەریم: س.پ، ل١٦،٣٠. عادل صدیق: هەڵەبجە شارێکی بچووک و مێژوویەکی دەوڵەمەند، چ١، لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی خاڵ بۆ هزر و ڕۆشنبیریی، ٢٠٢٠، ل١٢٢ ؛ عەبدولڕەقیب یوسف و عادل سدیق: بیرەوەرییەکانی حامی بەگی جاف، چ١، چاپخانەی تاران، لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی دۆستانی هەڵەبجە، ٢٠٢١، ل٨٩.





بووە، دوای کردنەوەی پۆلەکانی چوار و پێنج کراوە بە سەرەتایی، قوتابخانەکە لە خانوویەکی بچووکدا بووە، کە موڵکی حامید بەگی جافی قایمقامی هەڵەبجە بووە،[٥٣] بەڵام دواتر کاربەدەستان و دەوڵەمەند و خەڵکانی ئاسایی پارەیان کۆکردووەتەوە و خانووەکەیان نوێ و فراوان کردووە(١٩٢٦).[٥٤] بەهۆی نەبوونی قوتابخانەی کچانەوە، لە کۆتایی بیستەکانیشدا ژمارەیەک کچی شارەکە، کە زیاتر کچی کاربەدەست و دەوڵەمەند و ڕۆشنبیرەکانی شار بوون، لە هەمان خوێندنگا دەستیان بە خوێندن کردووە، ئەگەرچی لەسەر ئەو کارە سەرزەنشتی زۆر کراون. لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٠ بۆ یەکەمجار قوتابخانەی کچان لە هەڵەبجە[٥٥] کرایەوە، دیسان لەبەر نەبوونی خانووی تایبەت، خانوویەک بۆ قوتابخانەکە بەکرێ گیراوە.[٥٦] لە چەمچەماڵیش(١٩٢٨) بەپێی گێڕانەوەکانی مامۆستا ڕەشید کەریم یەک قوتابخانەی چوار پۆلی لێ بووە، کە لە خانوویەکی کۆندا بووە.[٥٧] لە قەڵادزێ هەتا ساڵی ١٩٥٥ تەنها یەک قوتابخانەی سەرەتایی شەش پۆلی لێ بووە، بەڵام خانووەکە تایبەت بووە بە قوتابخانە.[٥٨]

لە قەزا و ناحیە و ئەو گوندە گەورانەی، کە قوتابخانەیان بۆ کرابوویەوە، جگە لە نەبوونی ناوەندی و دواناوەندی، قوتابخانەکانیان پۆلی شەشی سەرەتایی تێدا نەبووە، هەربۆیە ئەوانەی لە پۆلی پێنج دەردەچوون، یان دەبوو واز لە خوێندن بهێنن، یاخود ڕوو لە و شارانە بکەن، کە ئەو قۆناغانەی خوێندنیان لێ بووە. هەموو کەسیش ئەو توانایەی نەبووە، لەبەرئەوە زۆر قوتابی بەناچاری وازی لە قوتابخانە هێناوە، بەنموونە دڵزار دوای ئەوەی، کە قۆناغی ناوەندی تەواو دەکات(١٩٤٢)، بەهۆی نەبوونی قوتابخانەی دواناوەندی لە کۆیە ناچار بووە، کە واز لە خوێندن بهێنێت، چونکە بارودۆخی ژیان ڕێگەی ئەوەی نەداوە لە هەولێر

---

٥٣عادل صدیق: هەڵەبجە شارێکی بچووک و، ل١٢١-١٢٦.

٥٤ڕ(پێشکەوتن)، ژ(١٤)، ١٩٢٦/٤/٢٩.

٥٥بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی خوێندنی میری بەگشتی و کچان بەتایبەتی لە هەڵەبجە بڕوانە: عادل صدیق: هەڵەبجە شارێکی بچووک و مێژوویەکی دەوڵەمەند، ل١١٨-١٤٥.

٥٦چاوپێکەوتنی ئارام عەلی سەعید لەگەڵ شەمسەخانی کچی ئەحمەدموختار جاف، ڕ(کۆمەڵ)، ژ(٢٣٢)، ٢٠٠٦/٧/٢٢.

٥٧مامۆستا ڕەشید کەریم: س.پ، ل١٦.

٥٨گەشتێک لە کوردستانا، ل١٤٩.

یان کەرکووک درێژە بە خوێندنەکەی بدات.[59] بەدڵنیاییەوە ئەم بابەتە بۆ کچان[60] گرانتر بووە.

وەک محەمەد ڕەسوڵ هاوار باسی کردووە، هەتا ئەو سەردەمەی ئەوانیش لە زۆر شوێنی کوردستاندا، دژایەتی خوێندنی میری دەکرا، بەتایبەتی خوێندنی کچان، بەشێک لە مەلا و شێخ و خەڵکانی نەخوێندەوار و دواکەوتوو بە ئاشکرا بەرەنگاری ئەو باوکانە دەبوونەوە، کە کچەکانیان دەخستە بەر خوێندن. ژمارەیەک لە نووسەران و شاعیران لەڕێگەی نووسینەوە زۆر هەوڵیاندا بەر بەو بیرکردنەوە دواکەوتوویە بگرن، هەربۆیە هانی خەڵکیان بۆ خوێندن، بەتایبەتی کچان دەدا.[61] لە شوێنێکی وەک شاری سلێمانیدا بڵاوکراوەکانی ئەو سەردەمە ڕۆڵێکی گەورەیان دەبینی لە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری. کەسێکی وەک حەپسەخانی نەقیب پشتیوان و لایەنگرێکی سەختی خوێندنی کچان بوو، تەنانەت خانوویەکی خۆی بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کردبوو.[62]

مەلا عەوڵای حاجی سمایل باسی ئەوەی کردووە، دوای ئەوەی لەژێر کاریگەری کوڕە جولەکەیەکدا هۆگری خوێندنی میری بووە و ئەو نیازەی لەلای باوکی درکاندووە، باوکی بە توڕەییەوە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "بەتەمای هۆگری منداڵە جولەکەکان ببێ و وەکوو ئەوان کافر ببی، من بە تەمام تۆ ببی بە مەلای دوازدە عیلم، بەتایبەتی دوای ئەوەی مەلای مزگەوت خەونێکی باوکمی بەوە لێکدابوویەوە کە کوڕەکەی دەبێتە مامۆستایەکی باش و بەوهۆیەوە حەفتا پشتی لە ئازاری قیامەت دەبەخشرێت".[63] مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسیش سەرباری حەزی منداڵەکانی بۆ خوێندن، لە تاقە قوتابخانەکەی گوندی بیارە، بەڵام ئەو ڕێگری لێکردوون و وای بە باشتر زانیوە، کە لە حوجرە درێژە بە خوێندنی فەقێیەتی بدەن، بۆئەوەی بە هەمان ڕێچکەی ئەودا بڕۆن، ئەوانیش بەناچاریی درێژەیان

---

٥٩ئەحمەد دڵزار: بیرەوەری ڕۆژانی ژیانم، بەشی یەکەم و دووەم، ل٤٦.

٦٠بەهیە حامیدبەگی جاف لە قوتابخانەی سەرەتایی کچانی هەڵەبجە هەموو ساڵێک یەکەمی پۆلەکەی خۆی بووە، بەڵام دوای تەواوکردنی پۆلی پێنجەمی سەرەتایی، بەهۆی نەبوونی پۆلی شەش لە قوتابخانەکەیاندا دەبوو ڕوو لە سلێمانی بکات، ئەوەش بۆ ئەو ڕۆژگارە قورس بووە، هەربۆیە بە ناچاری وازی لە خوێندن هێناوە. عەبدولڕەقیب یوسف و عادل سدیق: بیرەوەرییەکانی حامی بەگی جاف، ل٩٠.

٦١ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، ل٣٢.

٦٢ ه.س، ل٣٣.

٦٣ مەلا عەوڵای حاجی سمایل: س.پ، ل١١.

بەخوێندنی ئایینی داوە.[٦٤]

وادیارە بەهۆی گۆڕانی بارودۆخی ئابووریی و کۆمەڵایەتی، بیروباوەڕی خەڵک و ئەو هەلومەرجە نوێیەی، کە هاتبووە ئاراوە، خەڵکانێکی زۆر هۆگری خوێندن بوون، چونکە خەڵکانێک لەپێناو فێربوون، یان درێژەدان بەخوێندن ویستوویانە بخوێنن، بەڵام لەبەرئەوەی کاتی خوێندن لە ڕۆژدا بووە و ئەوانیش لە ڕۆژدا کاریان هەبووە، نەیانتوانیوە درێژە بە خوێندن بدەن، بەناچاری ڕوویان لە خوێندنی ئێواران، یان بەدەربڕینی ئەو ڕۆژگارە خوێندنی شەوان لەنێو قوتابخانەکاندا کردووە. بۆ ئەم مەبەستە، نوێنەرانی لیوای سلێمانی هەوڵی کردنەوەی قوتابخانەیان بۆ ئەو جۆرە خەڵکانە داوە.[٦٥] ئەم خوێندنگایە (خوێندنگای زانستی کوردان) بەپێی گێڕانەوەکانی شاکر فەتاح بەهۆی ڕووداوەکانی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ داخراوە، بیانووی حکومەتیش ئەوەبوو، کە مامۆستایان و خوێندکارەکانی ئەم خوێندنگایە بەشداری ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرایان کردووە و ڕۆڵیان هەبووە، بەڵام جارێکی تر لە ١٩٣١/٢/١٥ کرایەوە، هەر پاش کردنەوەی نزیکەی (١١٠)خوێندکار پەیوەندییان بە خوێندنگاکەوە کردەوە و سێ مامۆستاش خۆبەخشانە خۆیان بۆ خوێندنگاکە تەرخانکردووە.[٦٦] شاکر فەتاح لەکاتی گەشتەکەشیدا بۆ هەڵەبجە و هەورامان (١٩٣٣) باسی ئەوەی کردووە، لە خوێندنگای زانستی هەڵەبجە، شەوان شاگردەکان بە دووکاندارەکانیان خوێندووە، کە ژمارەیان (٣٠) خوێندکار بووە.[٦٧]

ئەوە سەرباری ئەوەی، لە زۆر شوێنی کوردستان بەتایبەتی لە گوندەکان، هەتا ساڵانی چلەکان و پەنجاکان قوتابخانە نەبووە، دەسەڵاتدارانی ئەو ناوچانە لە چاوکرانەوەی خەڵکی ناوچەکانیان بەهۆی خوێندنەوە ترساون، هەربۆیە دژایەتی کردنەوەی قوتابخانەیان کردووە.[٦٨] زۆری ڕێژەی نەخوێندەواری لەنێو گوندنشینان و دواکەوتوویيان، بەگووتەی دڵدار وایکردبوو، نەبنە خەڵکێکی هۆشیار، بەپێچەوانەوە، زۆرتر لە خەمی زەوییەکانیان و تێرکردنی سکی خۆیاندا

٦٤ ئازاد عەبدولواحید: حەمەی مەلاکەریم وچانێک لە بەردەم وێستگەکانی تەمەن و نووسیندا، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی(دهۆک)، هەولێر، ٢٠١٢، ل٤٦.

٦٥ محەمەد ئەمین زەکی: محاسەبەی نیابەت، ل٢٠.

٦٦ شاکر فەتاح: خەباتی ڕۆشنبیران، ل١٠.

٦٧گەشتی هەڵەبجە و هەورامان، ل١٦.

٦٨محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، ل٣٣.

بن و گرفتاری کۆمەڵێک شتی خورافی و هەندێک بیروبۆچوونی هەڵە بن. لاوازی ئەو هۆشیارییە سەری کێشابوو، بۆئەوەی بە چاوی بەرژەوەندی گشتی لە هیچ شتێک نەڕوانن.[٦٩]

سەبارەت بە زمانی خوێندنیش لەنێو قوتابخانەکانی کوردستاندا، لەگەڵ ئەوەی بەریتانییەکان بەتایبەتی خودی مێجەرسۆن لە ڕێگەی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ەوە زۆر گرنگییان بە زمانی کوری داو شێخ مەحمودیش لە ڕۆژی ١٩٢٢/١١/٢٨ بە فەرمانێک زمانی کوردی بە زمانی ڕەسمی لە تەواوی فەرمانگەکانی حکومەتەکەیدا ناساند،[٧٠] دواتریش نوێنەرانی کورد لە پەرلەمانی عێراق و ڕووناکبیران و کاربەدەست و لێپرسراوانی کورد زۆر جەختییان لە بەڕەسمی ناساندنی زمانی کوردی لە کوردستان و خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی کردەوە،[٧١] سەرباری ئەوانەش خوێندن تەنها لە لیوای سلێمانی و هەولێر بە زمانی کوردی بوو، لە شارەکانی دیکەی وەک خانەقین و شەنگال و شێخان و دهۆک و ئاکرێ و ئامێدی و زاخۆ بە زمانی عەرەبی بووە. لە لیوای کەرکووک تەنها لەو گەڕەکانەی، کە زۆرینە کوردبوون، قوتابخانەی کوردی تێدا بووە، لە شوێنەکانی دیکە بە عەرەبی، یان تورکی بووە.[٧٢] لەو سەرەتایەوە، کە ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە لکێنرا، لە هەندێ قەزا و ناحیەی سەر بە موسڵ خەڵکانێک واژۆیان کۆکردبوویەوە، ئەوەیان ڕەتکردبوویەوە، کە بە زمانی کوردی بخوێنن، تەنانەت چەند خۆپیشاندانێکیشیان بە منداڵەکانیان کردبوو.[٧٣]

لە ڕۆژی ١٩٢٦/١/٢١ سەرۆک وەزیرانی عێراق لە لێدوانێکیدا ڕایگەیاندبوو:

---

٦٩عەبدولخالق عەلادین: س.پ، ل٥٢.

٧٠عەبدولڕەقیب یوسف: عیسا بەگی بابان ئاواکەری مزگەوتی گەورە و مەدرەسەی هەڵەبجە، گ(هەزارمێرد)، ژ(٢٣)، ئەیلوولی ٢٠٠٣، ل١٥٨.

٧١بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەیەوە بڕوانە: مەریوان مەحمود ئەحمەد و ئەحمەد محەمەد ئەمین قادر: هەوڵەکانی پەرلەمانتارانی کورد لە عێراق بۆ بەدیهێنانی خوێندن بە زمانی کوردی(١٩٢٥-١٩٣٣)، گ(زانکۆی ڕاپەڕین)، VOL (٩) NOT (٢)، ٢٠٢٢/٣/٢٩ ؛ ٦١ ساڵ لەمەوبەر موتەسەڕیفی سلێمانی بەڕەسمی داوای بەکارهێنانی زمانی کوردی دەکات، گ(سلێمانی)، ژ(٢١)، نیسانی ٢٠٠٢، ل١٣ ؛ ٧١ ساڵ لەمەوبەر وەزارەتی ئابووریی و گەیاندنی عێراقی داوا ئەکات کە یاسای زمانە ناوخۆییەکان (اللغات المحلية) پەیڕەو بکرێت، گ(سلێمانی)، ژ(٢١)، نیسانی ٢٠٠٢، ل١٢ ؛ محەمەد ئەمین زەکی: دوو تەقەلای بێ سوود، ل٦٣-١١٤.

٧٢ محەمەد ئەمین زەکی: دوو تەقەلای بێ سوود، ل٧٦-٨٠، ٩٠، ٩٥-١٠٦ ؛ نووری شاوەیس: لە بیرەوەرییەکانم، گ(پێشەنگ)، ژ(٢)، ل١٠.

٧٣ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، ل٣٣.

“ئەم وڵاتە ناژی ئەگەر مافی ئەوانەی، کە لەگەڵمان دەژین نەدریت. پێویستە مافی کورد بدەین، مۆزەفیان لە خۆیان بێت و زمانەکەیان بە زمانێکی ڕەسمی بناسرێت و منداڵەکانیان لە قوتابخانەکاندا بە زمانی خۆیان بخوێنن”.[٧٤]

ئەحمەد خواجە ئاماژەی بەوە کردووە، کە هەتا ساڵی ١٩٢٨ لە هەولێر حکومەت بە عەرەبی و تورکی دەینووسی و بە کوردی نووسین ئێجگار کەم بووە.[٧٥] تێبینی ئەوەشی کردووە، کە زۆربەی خەڵکی خانەدان و ئاغاکانی نێو قەڵای هەولێر بە کوردییەکی تێکەڵە بە زمانی تورکی قسەیان کردووە، بیری کوردایەتیشیان زۆر کەم بووە، بەڵام کۆیە کوردایەتی لە جۆشدا بووە، بەشێوەیەک ئاغا و ئەفەندی و جوتیارییان وەک یەک نیشتمانپەروەر بوون. هەرئەوەش هانیداوە لەگەڵ ئاسەف ڕەئوفی کۆیی(١٩٣٠) زۆر نامەی نهێنی بۆ موتەسەڕیف و وەزیرەکانی حکومەتی عێراقی بنێرن و تیایدا داوای نووسین و خوێندن بە زمانی کوردی بکەن، لەوەدا ڕەشاد موفتیش(١٩١٥-١٩٩٢) هاوکارێکی باشیان بووە.[٧٦]

دڵدار، کە ئەو ساڵانە لە هەولێر خوێندوویەتی، باسی سەردانێکی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی کردووە، بۆ قوتابخانەکەیان، کە بە کوردی قسەی کردووە، ئەو بە کوردی قسەکردنە بەپێی گێڕانەوەکانی ناوبراو گڕوتینێکی نوێی داوە بە خوێندکارە کوردەکان و لە هەست بەبێ کەسی کردن ڕزگاری کردوون، هەروەک هیوایەکی نوێی پێ بەخشیون، کە بەرگری لە زمانی خۆیان بکەن.[٧٧]

ڕەوشەکە لە بادینان خراپتر بووە، سەجادی(١٩٥٥) دەڵێت: “ئەم وڵاتە (زاخۆ) بە هیچ جۆرێک نازانن کوردی بخوێننەوە، لەو ڕووەوە زۆر دواکەوتوون ... هی وایان هەبوو کە باسی خوێندن و نووسینم بە زمانی کوردی بۆ دەکرد، ملێکی با ئەدا و بەلایەوە شتێکی سەیر بوو، وەک ئەوەی هەتا ئێستا گوێچکەی بەو قسەیە ئاشنا نەبووبێ وابوو، دەستەی خوێندەوارانیان لەو بڕوایەدابوون کە دەبێ بە زمانی کوردی بخوێنن و بنووسن، بەڵام گرفتەکەیان ئەوەبوو کە توانای خوێندنەوە و نووسینیان بە سۆرانی نەبوو. ئەوەش وایکردبوو لە هەموو ناوچەکەدا خوێندن بە زمانی کوردی نەخوێنرێت، تەنانەت بەشی کوردی ڕادیۆش کە بە شێوەزاری

٧٤ محەمەد ئەمین زەکی: دوو تەقەلای بێ سوود، ل٧٢ ؛ ئەحمەد خواجە: چیم دی، ل٢٦٠.

٧٥ چیم دی، ل٢٤٤.

٧٦ ه.س، ل٢٤٦.

٧٧ عەبدولخالق عەلادین: س.پ، ل٥٨.

سۆرانی بوو، زۆر بە کەمی دەیان کردەوە و گوێیان لێ دەگرت".[٧٨] سەجادی لە زمانی حاجۆ ئاغای خەڵکی زاخۆوە ئەوەی گێڕاوەتەوە، کە ئەو و حازم بەگ[٧٩] لایەنگری خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی بوون، بەڵام خەڵکە ئاساییەکە زۆر حەزیان پێی نەکردووە، حاجۆ ئاغا نیگەرانی ئەوە بووە، کە هیچ کەسێک لە ناوچەکە، توانای نووسین و خوێندنەوەی بە زمانی کوردی نییە.[٨٠]

بەکورتی، بەهۆی ئەو هەموو ڕێگریی و لەمپەرانەی ئەو ڕۆژگارە لە بەردەم خوێندندا بوون، هەموو کەس خوێندنی بۆ تەواو نەدەکرا، نەجمەدین مەلا لەو پێشەکییەدا، کە بۆ بیرەوەرییەکانی مامۆستا ڕەشید کەریمی نووسیوە، ئاماژەی بەو ڕەوشە کردووە و گوتوویەتی: "ئەم بیرەوەرییە سەردەمی پێشوومان نیشان ئەدا، کە هۆی خوێندن لە وڵاتەکەمان چەند گران بووە، کەسێک بیویستایە بخوێنێ، خوێنی ئەبوو بە ئاو هەتا دیپلۆمی وەرئەگرت".[٨١]

---

٧٨ گەشتێک لە کوردستانا، ل٤٩-٥٠.

٧٩ حازم شەمدین ئاغا کوڕی یوسف پاشای کوڕی شەمدین ئاغا بووە، ساڵی ١٨٩٥ لە زاخۆ لەدایکبووە، لە چەند خولێکی پەرلەمانی عێراقدا نوێنەری لیوای موسڵ بووە، لە حکومەتەکەی تۆفیق سویدی وەزیری بێ وەزارەت وەرگرتووە، لەوە بەدواش هەتا کۆچی دوایی لە ئەنجومەنی پیرانی عێراق ئەندام بووە. جگە لەمە چەندین پلەوپۆستی کارگێڕی دیکەی وەرگرتووە و ڕۆڵی کاریگەری تیایاندا بینیوە، لە ٣ی حوزەیرانی ١٩٥٤ لە موسڵ کۆچی دوایی کردووە. بەپێی گێڕانەوەکانی سەجادی حاجۆ ئاغا و حازم بەگ لە بنەماڵەی شەمدین ئاغا بوون و ئامۆزای یەکدی بوون، هەردووکیان لە ناوچەی بادینان دەوڵەمەند و قسە ڕۆیشتووبوون. لەوکاتەدا حاجۆ ئاغاش لە تەمەنی ٤٥ ساڵیدا بووە و لە پەرلەمانی عێراق نائیب بووە. میر بصری: أعلام السیاسة في العراق الحدیث، ج٢، مطبعة دارالحکمة، لندن، ٢٠٠٤، ل٢٢٢ ؛ د.محمد علي الصویرکي: معجم أعلام الکرد في التاریخ الأسلامي والعصر الحدیث في کردستان وخارجها، مطبعة مؤسسة حمدی للطبع والنشر، من منشورات (بنکەی ژین)، السلیمانیة، ٢٠٠٦، ل١٩٨-١٩٩ ؛ عەلادین سەجادی: گەشتێک لە کوردستانا، ل٤٥-٤٦.

٨٠گەشتێک لە کوردستانا، ل٤٥-٤٦.

٨١مامۆستا ڕەشید کەریم: س.پ، ل٨.



سەعدون محەمەدی

# قەدەغەکردنی پەیامەکانی نوور لە ئەرشیفی کۆماری تورکیادا

ڕۆڵی سەعید نوورسی لە ڕووداوەکانی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانیدا دیار و بەرچاو بووە، بەتایبەت بوونی پرۆژەیەکی تایبەت بۆ قوتارکردنی دەوڵەتی عوسمانی لەو لاوازییەی دووچاری ببوو، دواتریش ڕووبەڕووبوونەوەی پیلانە دەرەکییەکانی ئەو سەردەمە کە خاکی دەوڵەتی عوسمانییان بە ئامانج گرتبوو، هەر لەو پێوەندەدا سەعید نوورسی دژایەتی پیلانی ئینگلیزەکانی لە ئیستانبوڵ کردبووە ئەرکی لە پێشینەی خۆی لەو دەورانەدا، بۆ ئەو مەبەستەش دەچێتە ئیستانبوڵ و ماوەیەکی زۆر لەو شارە دەمێنێتەوە و لەگەڵ ڕووداوەکانیدا ڕۆژەکانی دەگوزەرێنێت، چونکە ئەو کات ئیستانبوڵ چەقی ڕووداوە گەرمەکان بووە.

لە سەروبەندی هاتنەسەرکاری مستەفا کەمال ئەتاتورکدا نوورسی کارەکتەرێکی هەرە دیار بووە، لە سەرەتادا مەترسییەکانی سەر دەوڵەت هەردوو کارەکتەرەکە بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات و لەناو ڕووداوە گەرمەکانی ئەوکاتدا ناویان دیارە، ئەتاتورک وەک سیاسیی و فەرماندەیەکی سەربازی دێتە ناسین و نوورسیش پێگەیەکی زانستی و ئایینی دیاری ئەو ڕۆژگارە بووە، ڕۆڵ و پێگەی نوورسی بۆ بەرەی ئەتاتورک شاراوە و پەنهان نەبوو، بەڵکو ئەوان بەڕوونی دەرکیان بە گرنگی پێگەی نوورسی لەناو خەڵک و ڕووداوەکاندا کردبوو، هەربۆیە بەناوی دەوڵەتەوە داوەتنامەی فەرمی بۆ دەنێرن هەتا سەردانی ئەنکەرەی پایتەخت بکات.

ئەگەرچی ئەتاتورک سەرەتا وەک ڕێبەرێکی نیشتمانی دەبینرا، لەبەرئەوەی سەرکردەیەکی مەیدانی بەرەکانی شەڕ بوو لەو سەردەمەدا و نازناوی (غازی) پێدرابوو، بەڵام دواتر و دوای ڕاگەیاندنی کۆماری تورکیا وێنەیەکی تری ئەو پیاوە خۆی نیشاندا، بۆیە لێرەوە ململانێیەکی دوورودرێژی نوورسی و ئەتاتورک دەستپێدەکات. نوورسی لە نامەیەکی ١٠ خاڵیدا ئەتاتورک ئاگادار دەکاتەوە، هەر پرۆژەیەک بەناوی چاکسازیی و نوێگەرییەوە ئەنجامبدات دەبێت بنەما نەگۆڕەکانی کۆمەڵگەی تورکی لەبەرچاو بگرێت. سەرەنجام ئەم پەیامەی نوورسی لەلایەن ئەتاتورکەوە بە سوکایەتی لێکدەدرێتەوە و دەبێتە هۆکاری تورەبوونی، لێرە بەدوایشەوە ناکۆکییەکانی نێوان ئەو دوو کارەکتەرە ئاڕاستەیەکی تر وەردەگرن.

دواتر لە داوەتکردنی نوورسی بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی ئەوکات، ململانێکان لە پەیامەوە دەبنە ڕووبەڕووبونەوەی دوو کاریزما و دوو پرۆژەی جیاواز، لە ئەنجامدا لە ساڵی ١٩٢٥ بڕیاری قەدەغەکردنی بانگ بە زمانی عەرەبی درا، مەدرەسەکان داخران و بەشێک لە مزگەوتەکان گۆڕدران بۆ مۆزەخانە و لە ساڵی ١٩٢٨ دا بەکارهێنانی پیتی عەرەبی لە نووسینی تورکیدا گۆڕدرا بە پیتی لاتینی، هەر لەو سەروبەندەدا نوورسیش دوورخرایەوە بۆ ناوچەی (بارلا) لە شاری ئیسپارتە. (١)

شایەنی باسە، نوورسی ماوەی هەشت ساڵ لەو ناوچەی بارلا دەمێنێتەوە و سەرقاڵی نووسینی پەیامەکانی نوور دەبێت و کۆمەڵێک خوێندکار لە نزیکی دەبن و ئەرکی بڵاوکردنەوەی پەیامەکان لە ئەستۆ دەگرن، لەو دەورانەدا هەرچەندە بەکارهێنانی پیتی عەرەبی قەدەغە بوو، بەڵام نوورسی هەر بەو پیتانە پەیامەکانی دەنووسییەوە، ناوەڕۆکی نووسینەکانیش کۆمەڵە پەیامێک بوون لەبارەی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژگارەوە، ئیتر ململانێکان لەو قاوغەدا نامێننەوە، لێرەوە دادگا و زیندان دەبنە مەیدانێکی نوێی ململانێکان و دەوڵەت هەوڵدەدات لەڕێگەی دادگاوە سنورێک بۆ بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور دابنێت و خاوەنەکەشی بێدەنگ بکات.

**دادگای ئەسکی شەهیر:**

کاربەدەستانی دەوڵەت بە پەیامەکانی نوور گەلێک سەغڵەت ببوون، بۆیە هەنگاوی کردەییان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پەیامەکانی نوور و خاوەنەکەی گرتەبەر، ئەو کارەشیان بە گرتنەبەری ڕێگای دادگا دەستپێکرد، چونکە ئەوەی نوورسی لە ماوەی هەشت ساڵدا ئەنجامی دابوو، بەگوێرەی وتەی (شوکر کایا) ی وەزیری ناوخۆ و دۆستی نزیکی ئەتاتورک، بۆ دەوڵەت جێگەی سەرسوڕمان بوو، سەرەنجام دادگای ئەسکی شەهیر لە ١٩٣٥/٨/١٩ بڕیاریدا بە زیندانیکردنی نوورسی بۆ ماوەی شەش مانگ و دواتر بڕیاری دوورخستنەوە و هێشتنەوەی زۆرەملێی نوورسی لە شاری قەستەمونی باکووری تورکیای دەرکرد.

**دادگای دەنیزلی و ئافیۆن:**

ئەگەرچی لە ساڵی ١٩٣٨ مستەفا کەمال ئەتاتورک کۆچی دوایی دەکات، بەڵام پرۆسەی دادگایی کردنی پەیامەکانی نوور بەردەوامی دەبێت، ئەمجارەیان لە ساڵی ١٩٤٤ لە ڕێگەی دادگای دەنیزلییەوە هەوڵی قەدەغکردنی پەیامەکانی نوور دراوە و نوورسی ڕاپێچی دادگا کراوە و کۆمەڵێک تۆمەتی ڕووبەڕووکراوەتەوە، بەڵام دادگا ئەوی بەریکرد لە تۆمەتەکان، دواتر لە ساڵی ١٩٤٨ لە ڕێگەی دادگای ئافیۆنەوە بڕیاری زیندانیکردنی بۆ دەردەچێت و ماوەی نزیکەی ساڵێک زیندانی دەکرێت.(٢)

ئەگەرچی ئەم مێژووە سەرەتا بە ململانێی دوو کەس دەستیپێکرد، بەڵام لەڕاستیدا ڕووبەڕووبوونەوەی دوو پرۆژەی جیاواز بوو هەردووکیان هەوڵی جێگرتنەوەی ئەویتری دەدا و لەو نێوەندەشدا کارەکتەرە هەرێمیی و دەرەکییەکانیش ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاوە لە دنەدانی ڕووداوەکان و درێژەکێشانی ململانێکان.

**بەڵگەنامەکان:**

١-سەرۆکایەتی وەزیران، بەڕێوەبەرایەتی گشتی بڕیارەکان، بڕیاری ژمارە ١٣\ ٦٧٠٧.

کتێبی (موعجیزاتولقورئان) کە لەلایەن سەعید کوردییەوە بە پیتی عەرەبی نوسراوە و چاپکراوە، بڵاوکردنەوەی قەدەغەیە و ئەوەندەشی لەبەردەستایە دەبێ کۆبکرێتەوە. ئەم بڕیارە لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە لە ڕێکەوتی ١٩٤٧/١١/٧ بە ژمارەی ١٣٣١١-٢٢-٦٣٦٦٣ بە پشتبەستن بە یاسای ژمارە ١٨٨١ لەبری یاسای ژمارە ٢٦٥٧ بەپێی ماددەی ٥١ لە یاسای ئاماژە بۆکراو دەرچووە. لە خوارەوە واژۆی ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیرانی لەسەرە.



T. C.
BAŞBAKANLIK
MUAMELÂT UMUM MÜDÜRLÜĞÜ
Kararlar Müdürlüğü
Karar sayısı
3
964I

KARAR

I0/2/I949 tarihli ve 3/8760 sayılı karara ektir.

Saidi Nursi-Kürdi tarafından yazılan Gençlik rehberi adlı kitabın dağıtımının yasak edilmesi ve elde edileceklerinin toplattırılması, İçişleri Bakanlığının I4/7/I949 tarihli ve I33II-22/353I5 sayılı yazısı üzerine I88I sayılı kanunun 2657 sayılı kanunla değiştirilen 5I inci maddesine göre Bakanlar Kurulunun I5/7/I949 tarihli toplantısında kararlaştırılmıştır.

CUMHURBAŞKANI

Başbakan — Devlet Bakanı Başbakan Yardımcısı — Devlet Bakanı — Adalet Bakanı

Millî Savunma Bakanı — İçişleri Bakanı — Dışişleri Bakanı — Maliye Bakanı

Millî Eğitim Bakanı — Bayındırlık Bakanı — Ekonomi ve Ticaret Bakanı — Sağlık ve S. Y. Bakanı

G. ve Tekel Bakanı — Tarım Bakanı — Ulaştırma Bakanı — Çalışma Bakanı — İşletmeler Bakanı

٢- کۆماری تورکیا، ئەنجومەنی وەزیران، بەڕێوەبەرایەتی، گشتی بڕیارەکان، بڕیاری ژمارە ٩٦٤١\٣. لە ڕێکەوتی ١٤٤٩/٢/١٠ هاوپێچ بە بڕیاری ژمارە ٨٧٦٠\٣ کتێبی (ڕێبەری لاوان) کە لەلایەن سەعید نوورسی- کوردییەوە نوسراوە، بڵاوکردنەوە و دەستاودەست پێکردنی قەدەغەیە.

وەزارەتی ناوخۆ لە ڕێکەوتی ١٩٤٩/٧/١٤ بە ژمارە ١٣٣١١-٢٢-٣٥٣١٥ بە پشتبەستن بە یاسای ژمارە ١٨٨١ لە بری یاسای ژمارە ٢٦٥٧ بە پێی مادەی ٥١ لە یاسای ئاماژە بۆکراو لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیران ئەم بڕیارە دراوە. لە خوارەوە واژۆی تەواوی ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیرانی لەسەرە.



BAŞBAKANLIK
MUAMELÂT UMUM MÜDÜRLÜĞÜ
Kararlar Müdürlüğü
Karar sayısı
3
7830

KARAR

Saidi Kürdi Bediüzzaman diğer adı Saidi Nursi tarafından arap harfleriyle yazılmış olan "Sirecinnur" ve "Hacematı sitte" adındaki kitapların herhangi şekil ve suretle basılmış ve basılacak olanlarının dağıtılmasının yasak edilmesi ve elde edileceklerinin toplattırılması; İçişleri Bakanlığının I5/7/I948 tarihli ve I33II-22/4238I sayılı yazısı üzerine, I88I sayılı kanunun 2657 sayılı kanunla değiştirilen 5I inci maddesine göre, Bakanlar Kurulunun I5/7/I948 tarihli toplantısında kararlaştırılmıştır.

٣- کۆماری تورکیا، ئەنجومەنی وەزیران، ڕەرێوەبەرایەتی، گشتی بڕیارەکان، بڕیاری ژمارە ٧٨٣٠١٣

کتێبی( سیراجولنور- حاجەماتی سیتە) کە لەلایەن بەدیعوززەمان سەعید کوردییەوە بە پیتی عەرەبی نوسراون، چاپکردنیان قەدەغەیە و ئەوەشی چاپکراوە دەبێ کۆبکرێتەوە، چونکە دەستاودەستکردنیشیان قەدەغەیە.

وەزارەتی ناوخۆ ١٩٤٨/٧/١٥ بڕیاری ژمارە ١٣٣١١-٢٢-٤٢٣٨١ بە پشتبەستن بە یاسای ژمارە ١٨٨١ لەبری یاسای ژمارە ٢٦٥٧ بەپێی مادەی ٥١ لە یاسای ئاماژە بۆکراو، ئەم بڕیارە بە واژۆی تەواوی ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران دەرچووە.



T. C.
BAŞBAKANLIK
Muamelat Umum Müdürlüğü
Kararlar Müdürlüğü
Karar sayısı
3
6707

T. C.
BAŞBAKANLIK
CUMHURİYET ARŞİVİ

KARAR

Saidi Kürdi tarafından yazılıp Arap harfleriyle teksir edilmiş olan "Mucizatülkur'an" adlı kitabın dağıtılmasının yasak edilmesi ve mevcutlarının toplattırılması; İçişleri Bakanlığının 7/II/1947 tarihli ve 13311/22/63663 sayılı yazısı üzerine, 1881 sayılı kanunun, 2657 sayılı kanunla değiştirilen 51 inci maddesine göre, Bakanlar Kurulunun 11/12/1947 tarihli toplantısında kararlaştırılmıştır.

CUMHURBAŞKANI

## سەرچاوەکان


- https://www.risalehaber.com/bediuzzamanin-mahkemeleri-
- Tez ve Antitez: Said Nursi ve Atatürk mücadelesi (https://www.sorularlasaidnursi.com)
- Belge 030280101115776
- Belge 0301801120572
- Belge 030180102117522



# لە هەڵەبجەوە بۆ ڕۆما
# سەربردەی زانایەکی هەڵەبجەیی
# لە سەردەمی عوسمانیدا



هێمن عومەر خۆشناو

زۆر زانای کورد، ئەو دەمەی لە وڵاتی خۆیان چوونەتەدەر، لەبەر شارەزایی و پڕ زانستییان لە هەر شوێنێک ژیابن، ڕۆڵ و کاریگەرییان هەبووە و هەوڵ و کۆششەکانیان لەنێو لاپەڕەکانی مێژووی ئەو ناوچەیەدا تۆمارکراون. یەکێک لەو زانایانە کە زۆربەی ژیانی لە دەرەوەی کوردستان بەسەر بردووە، بەڵام ڕۆڵ و کاریگەرییەکەی دیار و بەرچاوە و لە ڕۆمای ئەوسا (خاکی بن دەستی عوسمانی) و لە چەند شارێکی مسوڵمانئنشیندا وەک موفتی دەوری خۆی بینیوە. لەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا و دوای گەڕان و لێکۆڵینەوە؛ سەربوردەکەیمان لە دوو توێی دۆسیەیەکی ١١٩ لاپەڕەیی دۆزییەوە و کورتەکەی لێرەدا دەخەینە ڕوو:

ناوی محەمەدە و ناسراوە بە زاهیر و باوکی ناوی عەزیز بەگ بووە، لە بەگەکانی جافی نێو هەڵەبجەن و بنەماڵەکەیان بەگی (وەڵەدبەگی)یان پێدەڵێن. لە ساڵی ١٢٨٦ی کۆچی بەرانبەر ساڵی ١٨٦٩ی زایینی لە دەوروبەری هەڵەبجەی ناوەندی قەزای گوڵعەنبەر لەدایکبووە. وەک خۆی نووسیویەتی سەرەتا لە قوتابخانەی ناڕەسمیی عەشیرەتەکەیدا دەستی بە خوێندن کردووە و قورئانی پیرۆز و هەندێ کتێبی فارسی دەستپێکردووە. لە ساڵی ١٣٠٢ی کۆچی بۆ خوێندن چووەتە مەدرەسەی گوندی بیارە و دەستی بە کتێبە سەرەتاییەکان کردووە و پاشان دەچێتە پێنجوێن(ناوەندی ناحیەی قزڵجە) و لای عەللامەی بەناوبانگ مەلا عەبدولڕەحمانی گەورەی پێنجوێن دەخوێنێت و پاش ماوەیەک دەچێتە سلێمانی لای مەلا ڕەسوولی واعیز دەخوێنێت و لەوێشەوە دەچێتە کەرکووک لە مەدرەسەی حاجی ئەحمەد بەگ لای مەلا عەلی حاجی وەهابزادە دەخوێنێت، پاشان دەچێتە بەغدا لای زانای ناودار مەلا عەبدولڕەحمانی ابن الخیاط دەمێنێتەوە و ئەنجا دەگەڕێتەوە هەڵەبجە و لە مزگەوت و مەدرەسەی پاشا لای شێخ محەمەد قەرەداغی دەمێنێتەوە و دواجاریش دەچێتەوە پێنجوێن و لە خزمەت مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوێنی خوێندنی تەواو دەکات و هەر لای ئەویش لە تەمەنی ٣١ ساڵیدا و لە ساڵی ١٣١٧ی کۆچی ئیجازەنامەی زانستی وەردەگرێت.

دوای ئیجازەوەرگرتن، پێنج ساڵ لە کوردستان یان بەغدا دەمێنێتەوە و بەتەواوی نازانرێت مەلایەتی لە کوێ کردووە (بۆیە گومان دەکەین لە بەغدا مابێتەوە، چونکە کە چووەتە ناوچەی یۆنانی ئێستا، لای خەڵک بە بەغدادلی خۆجە، واتە مامۆستای بەغدایی ناسراو بووە، ئەگەر چی بەشێک لەوانەی پاشناویان بەغدادییە، لە بنەڕەتدا کوردن، چونکە ئەوسا بەغدا ویلایەتێکی گەورە بووە و لە بیری خەڵکی ئەستەنبوڵ و دەوروبەریدا خەڵکی عێراقی ئێستا بەگشتی بە

بەغدادی ناسراوبوون). پاشان مل بە ڕێگاوە دەنێت و دەچێتە (سلانیک)ی یۆنانی ئێستا-ئەو سەردەمە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بووە- و لەوێ لە ساڵی ١٣٢٣ی کۆچیدا لە مەدرەسەی سەرای عەتیق لای مودەڕیسی خوالێخۆشبوو یەعقووب ئەفەندی ئیجازەنامەی زانستی وەردەگرێت. (وەک خۆی لە شوێنێک باسی دەکات، لە دامەزراوە ڕەسمییەکانی ئەو شارەدا داوای ئیجازەنامەی لێدەکەن، ئەویش ئیجازەنامەکەی خۆی کە لە مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوێنی وەریگرتبوو، لە ڕێگەی گەشتەکەیدا ونی کردبوو، هەربۆیە بە ناچاری جارێکی تر دەخوێنێتەوە و لای ئەو زانایەی سلانیک ئیجازە وەردەگرێتەوە-).

هەر لە هەمان ساڵدا و لە مانگی نیساندا لە قەزای عورتحەصار و لە مەدرەسەی گوندی ئیستیفیجەدا بە مودەڕیس دادەمەزرێت. لە ساڵی ١٣٢٦ی کۆچی لە ناحیەی ساری شەعبان و لە گوندی منجونس لەسەر وەسیەتی مودەڕیسی خوالێخۆشبوویان، خەڵکی گوند داوایان کرد و بەوهۆیەوە لەوێ دامەزراوە. لەو مەدرەسانەدا دەرسەکانی، نەحوو، سەرف، ئادابی مونازەرە، حیکمەت و کەلام، ئوسولی فیقهـ بەیان، مەعانی، بەیدع، عەرووز، حیساب، ماتماتیک، تەشریحی ئەفلاک ی گوتووتەوە.

زمانەکانی تورکی، عەرەبی و فارسی بە پلەیەکی زۆرباشی قسەکردن و نووسین زانیوە و لەگەڵیشیدا وەک خۆی نووسیویەتی بە کوردییش قسە دەکات.

**بەرهەمەکانی:**

١-کتێبێکی لەبارەی مەنتیق وەک تەعلیقات لەسەر کتێبی (برهان گلنبوی) هەیە و هەتا بەشی (تصورات) نەوەد لاپەڕەی نووسیوە و تەواو نەبووە، بۆیە چاپ نەکراوە.

٢-مجمع الأنهر في شرح ملتقى الأبحر ومعه الدر المنتقى، شەرح کردووە (ئەم کتێبە و کتێبەکەی سەرەوە بە عەرەبین و چاپ نەکراون).

٣-دیوانێک یان کۆمەڵە غەزەلێکی بە فارسی هەیە و چاپ نەکراوە.

٤-لەگەڵ چەند ڕیسالەیەکی تر. (ئەمانە خۆی باسیان دەکات و بەداخەوە هەتا ئێستا سۆراغیان نازانین).

**زانیارییەکانی نێو تەسکەرەکەی:**

تەزکیرەی سەردەمی عوسمانی کە تا ئەم دواییانەیش لەناو کورددا بە (تەسکەرە) ناسرابوو، لە جێی ناسنامەی ئێستابوو و لە بەڵگەنامەکەدا وێنەی تەزکیرەکە دەبینرێ و ئەم زانیارییانەی خوارەوەی تێدا تۆمارکراوە:

ناو و نازناو: مەلا محەمەد ئەفەندی



ناوی باوک: خوالێخۆشبوو عەزیز بەگ
ناوی دایک: خوالێخۆشبوو نەشئەت
ساڵ و شوێنی لەدایکبوون: ١٢٨٤، گوندی قەرەجان[١]–ی دەوروبەری هەڵەبجە
پیشە و خزمەت: مەدرەسەنشین.
باری خێزانی: یەک هاوسەری هەیە.
شێوەی ڕووخساری:
بەژن: مامناوەند
ڕەنگی چاو: زەردی کاڵ
ڕەنگی پێست: گەنمی
تۆماری ناسنامە: سلانیک
ناوی گوند: ئەحمەد سوباشی
ژمارەی خانوو: ١٢٢
لەناو بەڵگەنامەکاندا ناوی بە مەلا محەمەد ئەفەندی، محەمەد ظاهیر و محەمەد ظاهیر گوڵعەنبەری هاتووە.

**نوسخەی ئیجازەنامەکەی:**

وەک خۆی ئاماژەی پێدابوو، لە ڕێگای گەشتەکەی بۆ سلانیک، دەقی ئیجازەنامەکەی مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوێنی لێ ون بووە و ناچار جارێکی تر ئیجازەنامەیەکی لە زانایەکی ئەو دەڤەرە بەناوی (یعقوب صدقی بن نعمان بن یوسف البهرام ددەوی اللنقظەوی) وەرگرتووە. لە ئیجازەنامەکەدا هاتووە:

الحمد لله الذی انبت دوحة العلم فی صدور العلماء وجعل ثمارها انوار احکام الشریعة الغراء، اللهم رب الارباب مالک

---

١ ناوی ئەم گوندەمان بۆ ساغ نەبوویەوە، قەرەچان، قەرەجان؟

الرقاب، منزل الكتاب، محقق الحق وملهم الصواب الذى احاط بكل شىء علما ونصب من مصنوعاته على كمال قدرته علما، صل وسلم على افضل من اوتى الحكمة وفصل الخطاب.....كاتێ ناوی ئیجازەوەرگریشی هێناوە، ئاوا وەسفی کردووە: الاخ الامجد العالم الفطن اللبيب اللوزع الاديب، ذو الطبع السليم الوقار والذهن القوى النقاد (محمد ظاهر ابن عزيز بگ الجافى الگلعنبرى)...

وادیارە ئیجازەنامەکەیش لە ١٣٢٣ی کۆچی لە مەدرەسەی ئەسکی سەرای (کە گەڕەکێکی گەورەی مسوڵمانەکانی سلانیک بووە) نووسراوە.

**مەلا محەمەد وەک مودەڕیس و موفتی:**

لە ساڵی ١٣٢٧ی کۆچی لە تەمەنی چلویەک ساڵیدا بە ڕەسمی بووەتە مودەڕیسی مەدرەسەی گوندی منجونوسی عورتحصار و دیارە خەڵکی گوندەکە داوایان کردووە و لەسەر ئەو داوایەیان دامەزراوە. بەڵام هیچ مووچەیەکی لە دەوڵەت نەبووە و ئەو نووسراوی دامەزراندنی بێ مووچەییەشی لە فەرمانگەی موفتیایەتی ناوچەکە لە ١٣٢٧/١/١ی کۆچیدا تەسدیق کراوە. ناوبراو کاتێک ئەم کورتە ژیاننامەیەی خۆی نووسیوەتەوە، لە ٢١ی جەمادیلئاخیرەی ١٣٢٨ (١٩١٠/٦/٣٠ز) بووە، موفتیی قەزای عورتحصار بووە و مۆری خۆی لێداوە و لە مۆرەکەدا ناوی محەمەد ظاهر و مێژووی ساڵی ١٣٢٨ی تێدا بەدیاردەکەوێت.

**بوونی بە موفتی:**

مەلا محەمەد لە چەند شار و قەزایەکی ئەوسای عوسمانیدا بووەتە موفتی، لەوانە:

**١-موفتیی عورتحصار:**

عورتحصار(کلکس) -بە یۆنانییەکەی ناوەکە (Palaio Gynaikokastro)یە دەکەوێتە نێوەڕاستی مەکدۆنیا و یەکێکە لە شارەکانی یۆنان و دانیشتووانەکەی مەکەدۆن و ئەلبان و تورکن و ئەوسا سەر بە ویلایەتی سلانیک بووە. وادیارە لەبەر زانایی و لێهاتوویی مەلا محەمەد، خەڵکی ناوچەکە بە زانا و پیاوماقووڵەوە نووسراویان بۆ فەرمانگەی موفتیایەتی کردووە و داوای ئەوەیان کردووە کە محەمەد ظاهیر ئەفەندی ناسراو بە مودەڕیسی بەغدا ساڵی پێشوو لە گوندێکی ئەو ناوچەیە دەستی بە دەرسدانەوە کردووە و خاوەنی عیلم و کەماڵ و زوهد و وەرەع و سوودێکی زۆری بە خەڵکی ناوچەکە گەیاندووە، بۆیە شایانیەتی ببێتە موفتی لەو قەزایە و داوا دەکەن کە پێشنیازەکەیان بە هەند وەربگیرێت. نووسراوەکە لە ١٨ی شەووالی ١٣٢٧ی کۆچی بەرانبەر ١٩٠٩/١١/٢ کراوە.

بەگوێرەی بەڵگەنامەیەک کە مێژووی ١٨ی مایسی ساڵی ١٣٢٩ی ڕۆمی



(١٩١٣/٥/٣١) لەسەر نووسراوە، مەلا محەمەد ظاهیر ئەو کاتەی موفتیی قەزای عورتحصار بووە، داخوازینامەیەکی بۆ مەشیخەتی عوسمانی نووسیوە و داوای ئیستیرحامنامە و یارمەتی کردووە. لە داخوازییەکەدا هاتووە کە بەندە چەند ساڵێکە لەو قەزایەدا مودەڕیس و موفتییە و خزمەتی کردووە، تا ئێستا هیچ ئیسترحامنایەکی پێ عەتا نەکراوە، بۆیە داوا دەکات یارمەتی بدرێت. لەسەر ناوی خۆیشی؛ خۆی وەک موفتی و مودەڕیسی عورتحصار ناساندووە. دیارە دوای شەڕی باڵکان و لەدەستدانی سڵانیک ناوبراو مووچەکەی لە ئیزمیر وەرگرتووە و دواتر بۆ قۆنیە کۆچی کردووە



**٢-موفتیی لە قەزای ئەرگەلیی قۆنیە:**

دیارە دوای لەدەستدانی سلانیک و هاتنی هێزەکانی یۆنان بۆ ناو شارەکە کە بە شەڕی بەلکان (١٩١٢/١١/٩) ناسراوە، عوسمانییەکان دەکشێنەوە و مەلا محەمەدیش لەو شارە نامێنێ و ماوەیەک لە ڕۆمێلی ئیزمیر دەبێت، دواتر لە قەزای ئەرگەلیی سەر بە شاری قۆنیە دەبێتە موفتی. بەگوێرەی بەڵگەنامەیەک کە مێژووی ٤ی جەمادولئاخیرەی ساڵی ١٣٣١ی کۆچی (١٩١٣/٥/١١ز) لەسەر نووسراوە، ئاماژە بەوە دراوە کە محەمەد ظاهیر ئەفەندی لە جێی عەلی ئەفەندی لەو قەزایەدا ببێتە موفتی.

**٣-موفتیی لە ئەدەنە:**

قۆناغی سێیەمی موفتیەتی ناوبراو، لە ناوەندی ویلایەتی ئەدەنەیە و ساڵی ١٣٣٢ی ڕۆمی بۆتە موفتی و هەشت ساڵ لەو پۆستەدا ماوەتەوە. وەک لە بەڵگەنامەکاندا دیارە لەو شارەدا وێڕای موفتیایەتی خاوەنی مەدرەسەیەکیش بووە و بە ڕەسمی لەپاڵ موفتیایەتیدا؛ خۆی وەک بەڕێوەبەر و مودەڕیسی ئولای مەدرەسەکەش ناساندووە. دیارە لەو سەردەمەدا هێزەکانی فەڕەنسا لە ئەدەنە بوون، بۆیە لە نامەیەکیدا لە ١٩١٩/١٢/١٤ داوای درێژکردنەوەی مۆڵەتی لە فەرمانگەی مەشیخەت کردووە بەهۆی هەبوونی هێزەکانی فەڕەنسا لە شارەکەدا.

**٤-موفتیی لە مقری کۆی:**

ئەم قەزایە کە ئێستا ناوەکەی گۆڕاوە بۆ (بەکرکۆی) سەر بە ئەستەنبوڵ بووە و وا دیارە دوای نەخۆشکەوتنی و لەبەرئەوەی زۆربەی کات بۆ چارەسەر لە نەخۆشخانەکانی ئەستەنبوڵ بووە، بۆیە لە ساڵی ١٩٢٢ ڕاژەکەی لە ئەدەنەوە گواستووەتەوە ئەم قەزایە و بووەتە موفتیی شارەکە، بەڵام تەنیا هەشت مانگ لەسەر کارەکەی بەردەوام بووە و بەهۆی نەخۆشییەوە وەفاتی کردووە.

**نەخۆشکەوتن و وەفاتی:**

بەگوێرەی بەڵگەنامەیەک، کە ساڵی ١٩٢٠ی لەسەر نووسراوە، داخوازینامەیەکی ناوبراوی تێدایە و ئاماژەی بەوە کردووە کە لە جێگا کەوتووە و تووشی نەخۆشی هەوکردنی سییەکان بووە و بەوهۆیەوە بۆ چارەسەروەرگرتن چووەتە ئەستەنبوڵ، بۆ ئەو مەبەستە داوای درێژکردنەوەی مۆڵەتی دوو مانگی تری کردووە و لە فەرمانگەی فەتوا و مەشیخەتیش ڕەزامەندیی لەسەر مۆڵەتەکەی دراوە. پێشتریش لە بەڵگەنامەیەکدا ئەوە نیشان درابوو کە ناوبراو نەخۆشی ڕۆماتیزمی هەیە. لەنێو

بەڵگەنامەکاندا ڕاپۆڕتی پزیشکەکەیشی تێدایە کە ناوی دکتۆر قودسییە –و لە ئەڵمانیا خوێندنی تەواوکردووە– و نۆرینگەکەی لە ئاکسەرای ئەستەنبوڵ بووە و ڕاپۆڕتەکەی لە مانگی ئاداری ١٩٢١ نووسیوە و تێیدا ئاماژەی بە نەخۆشییەکەی کردووە. وادیارە ئەو نەخۆشییەی بەردەوام بووە و هەتا سەرەنجام لە ١٩٢٢/١٠/٢٦ لە تەمەنی ٥٣ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. پێدەچێت گۆڕەکەیشی هەر لە ئەستەنبوڵ بووبێت.

**کورتەی سەربردەی فەرمانبەریی:**

–لە ٨ی زولحیججەی ساڵی ١٣٢٧ی کۆچی بووەتە موفتیی عورتحصاری سلانیک، بە مووچەی چوارسەد قڕووش و هەتا ١٦ی حوزەیرانی ١٣٢٩ی ڕۆمی بەردەوام بووە.

–لە ١٦ی حوزەیرانی ١٣٢٩ی ڕۆمی (١٩١٣/٦/٢٩) بووەتە موفتیی قەزای ئەرگەلی لە ویلایەتی قۆنیە و هەتا ٩ی تشرینی دووەمی ١٣٣٢ی ڕۆمی (١٩١٦/١١/٢٢)بەردەوام بووە.

–لە ١٥ی تشرینی دووەمی ١٣٣٢ی ڕۆمی (١٩١٦/١١/٢٨) بووەتە موفتی لە ناوەندی ویلایەتی ئەدەنە.

–لە ٢٣ی شوباتی ١٣٣٨ (١٩٢٢/٢/٢٢) بووەتە موفتی قەزای موضیرکوی بە مووچەی هەزار قڕووش لە ویلایەتی ئەستەنبوڵ و هەتا ڕۆژی وەفاتی لە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٣٣٨ی ڕۆمی (١٩٢٢/١٠/٢٦) بەردەوام بووە.

کۆی خزمەتەکەی دوازدە ساڵ و هەشت مانگ و دە ڕۆژ بووە. ئەگەرچی دوای مردنی وەک خانەنشینی هەموو ڕۆژانی خزمەتی دیاریکراوە، بەڵام نازانرێت مووچەی خانەنشینییەکەی کێ وەریگرتووە، ئایا منداڵی هەبووە، یان هەر هاوسەرەکەی وەریگرتووە؟ بەداخەوە زانیاریی دیکە لەبارەی خێزان و بنەماڵەکەی نازانین، ئەگەرچی دۆسیەی ئەم زانایەمان یەکێکە لە دۆسیە هەرە دەوڵەمەندەکان و زیاتر لە سەد لاپەڕە نووسراوی ڕەسمی تێدایە.

تۆ بڵێی چەندین زانای وا هەبووبن و لە غوربەت و دووریی کەسوکار ژیاون و نەوە و منداڵەکانیشیان ئێستا هەر نازانن لەکوێ هاتوون و چ کارەبوون!

ئەمە پوختەیەکی کار و ژیانی زانایەکی هەڵەبجەیی بوو، لەنێو دۆسیەیەکی ١١٩ لاپەڕەییدا، کە لە غەریبیدا سەری ناوەتەوە.

**ژێدەر:**

İST.MFT. MSH.SAİD.0179

# (یاری سەنگ دڵ) لە چامەکەی نالیدا

# لێکدانەوەیەکی بونیادگەرانە





د.ئیسماعیل بەرزنجی

ئەگەرچی ڕێبازی بونیادگەری لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا سالآنێکە پاشەکشەی تەواوی کردووە و گۆڕەپانی ڕەخنەی چۆڵ کردووە بۆ ڕێبازە پۆستمۆدێرنەکانی وەکوو (سیمیۆتیکا و پەرژێنکردن و ڕەخنەی کولتووری) و چەند ڕێبازێکی تر، کە بە ڕێبازەکانی پاش بونیادگەری دەناسرێن، بەڵام هێشتا دیدی بونیادگەرانە بۆ هەندێک تێکست و دەقی ئەدەبی و شیعری کارایی خۆی هەیە، چونکە هەرگیز ڕێبازێکی ڕەخنەیی بەتەواوی لەناو ناچێت بە هاتنی ڕێبازگەلی دیکە هەرچەندە زەمەن بە سەریدا تێپەڕێت، ئەمەش لەبەرئەوەیە هەریەکێک لەو ڕێبازانە تیشک دەخاتە سەر لایەنێک لە لایەنەکانی دەق و جەخت لە ڕەهەندێک دەکاتەوە، ڕێبازەکانی دواتر کە دێن بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێن و بۆشاییانەی ئەوەی پێشترە کە هەی بوون، بەڵام خۆشیان لایەنگەلێک فەرامۆش دەکەن کە گرنگی زۆریان هەیە، بۆیە لەم ڕووەوە بونیادگەری بەوە تاوانبار دەکرا کە زمانی دەقی کردووە بە (بتێکی پەرستراو) یان بە تێڕوانینێکی تر ڕەخنەگری لەناو زیندانی (زمانی دەق) دا بەند کردووە (حمودە، ١٩٩٨: ٥٥ و دواتر)، چونکە بە لای بونیادگەرەکانەوە تەنها و تەنها لە ڕێگای شیکردنەوەی زمانی دەقەوە دەگەین بە مانا و دەلالەتی کۆتایی و هیچ پێویستییەکمان بە دەرەوەی دەق نییە، بۆیە (ڕۆلان بارت) چەمکی (مردنی نووسەر)ی داهێنا وەک ڕێگایەک بۆ ئازادکردنی دەق لەمانا بەخشیندا (عیاش، ٢٠١٥، :٧٩).

مردنی نووسەر یان بەرهەمهێنی دەق بەواتای دابڕینی دەقەکەیە لە هەموو کاریگەرییەکی دەرەوەی خۆی، بەتایبەتی سیاقی کۆمەڵایەتی و مێژوویی، کە ئەمانە هیچ کاریگەرییەکیان نییە لە گەیشتن بەمانادا، بەڵکو زمانی دەقەکە دەسەڵات و هێزی تەواوی لەم پرۆسەیەدا هەیە، جا پەیوەست بە ناونیشانی ئەم بابەتەوە کە دەمانەوێت بگەین بە مانا و تێگەیشتنێکی گونجاو بۆ دەستەواژەی (یاری سەنگ دڵ) کە لە کۆتایی چامەکەدا هاتووە ئەوا ڕێبازی بونیادگەریمان بە باش زانی لەبەر هۆیەکی گرنگ کە یەکانگیرە لەگەڵ تێڕوانینی بونیادگەرەکان، ئەویش ئەوەیە ئێمە سەبارەت بە (چامەکەی نالی) هیچ زانیارییەکی ئەوتۆی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و بابەتیمان نییە هەتا لێیەوە بتوانین بگەین بە تەئویلێکی دروست بۆ ئەو دەستەواژەیە، تەنانەت لەسەر خودی ژیانی نالیش زانیاری زۆر بەردەست نییە و هەتا ئێستاش زۆر بەشی ژیانی نادیارە، ئەوەی سەبارەت بە چامەکەشی هەیە تەنها هەندێک ڕاو بۆچوونە و هیچی تر، جا لە دۆخێکی ئاوادا کە هیچ زانیارییەکی دڵنیاکەرەوە لە دەرەوەی چامەکە نەبێت

ئەوە تاکە سەرچاوەی مانابەخشین و تەئویلکردن خودی چامەکە خۆیەتی، بۆیە لێکدانەوەی بونیادگەرانە گونجاوترین شیکردنەوەیە، سەبارەت بە دەستەواژەی (یاری سەنگ دڵ) کە لەم بەیتەدا هاتووە و کۆتا بەیتی چامەکەیە (مودەریس، ١٩٧٦:١٩٧):

**حاڵی بکە بە خوفیە کە ئەی یاری سەنگ دڵ**

**نالی لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور**

ئەوا دەبینین قورسایی زۆری چامەکەی کەوتووەتە سەر، چونکە هەرچی پرسیار و ویستی زانینی حاڵ و بارودۆخی سلێمانی و دەوروبەریەتی لە کۆتاییدا بە ناردنی سەلام و زانینی حاڵی ئەو یارە کۆتایی دێت، بۆیە دەپرسین ئایا یاری سەنگ دڵ کێیە؟ بۆچی بە یار وەسف کراوە و ناوێکی دیاریکراو نییە؟ هەر بە ڕاستی مرۆڤێکە؟ یان دەکرێت شتێکی دیکە بێت؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە وەکوو گوتمان هیچ زانیارییەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی تەنانەت ئاماژەیەکیشمان نییە پشتی پێ ببەستین، بۆیە گەڕان و سوڕان بەناو چامەکەدا و وەرگرتنی تەئویل لە زمانی دەقەکە تاکە ڕێگایە لە بەردەممان.

لێرەوە دەمەوێ ئەوە بڵێم، کە دوای لێکدانەوە و وردبوونەوە لە چامەکە بۆم دەرکەوتووە، کە (یاری سەنگ دڵ) بریتییە لە (حوجرەکەی) نەک کەسێکی دیاریکراو و مرۆڤێک، ئەمەش بەم بەڵگانە:

**یەکەم**: ئەم چامەیە بۆ شوێن نووسراوە و نێردراوە نەک بۆ کەس، ڕاستە (سالم) دوای ماوەیەک وەڵامی ئەم چامەیەی داوەتەوە بە هەمان شێواز، بەڵام هیچ بەڵگەیەک نییە کە نالی چامەکەی خۆی بۆ ئەو ناردبێ یان تەنانەت بۆ کەسێکی تر جگە لەویش، بەڵکو بۆ سلێمانی نێردراوە و نووسراوە، هەربۆیە شوێن زۆرترین ئامادەیی هەیە لەناو ئەم چامەیەدا، بەڵام کەسەکان زۆر کەمن جگە لە ناوی (کاکە سوور)ێک کە نازاندرێت ئەویش واقیعییە یان تەنها لەبەر ڕەنگی سوور ئەو ناوە هاتووە هەتا پێچواندنەکە دروست ببێت، هەروەها شوێن لەم چامەیەدا ناسراو و دیاریکراو و زانراوە، وەکوو (سلێمانی، شارەزوور، خانەقا، سەرشەقام، کانی ئاسکان ... هتد)، بەڵام کەسەکان زۆر کەمن، ئەوەشی کە هەیە نادیار و نەناسراو و دیارینەکراوە وەکوو (خەڵکەکەی، ڕەقیبانی لەندەهور، فەقێکان ... هتد)، کەواتە شوێن زاڵ و ناسراوە و زۆرترین پانتایی داگیرکردووە، حوجرەکەش کە شوێنێکی تایبەتی و ناسراو زۆر دیاریکراوە دەکرێ (یاری سەنگ دڵ) بێ.

**دووەم**: لەم چامەیەدا قسە و گفتوگۆ  لەگەڵ بێگیان دەکرێت نەک لەگەڵ کەسدا، بەپێچەوانەی گفتوگۆی ئاسایی کە لە نێوان کەسەکاندا دەکرێت، هەر لە سەرەتاوە (با/ بێگیان/ شت) ڕادەسپێرێت و ئەرکێکی پێ دەسپێرێت، چەندین پرسیاری جۆراوجۆری لێدەکات کە لایەنی یەکەمی گفتوگۆکار دیارە و مرۆڤە کە پرسیارکەرە، بەڵام لایەنی دووەم، کە وەڵامدەرەوەیە بێ دەنگە، ئایا بەرد و داری مەحەللەکان، پردی سەر شەقام،  داری بیرمە سوور، چۆنن؟ ماون؟ پرسیار هەیە، بەڵام وەڵام نیە، بۆچی؟ چونکە پرسیارکەر مرۆڤە، بەڵام پرسیارلێکراو شتێکی بێگیانە کە (با)یە، بەهەمانشێوە لە گفتوگۆی ناردنی (سەلام)دا نێرەری سەلام دیارە و مرۆڤە، بۆیە قسە دەکات و سەلام دەنێریت، بەڵام (سەلام بۆ نێردراو) مرۆڤ نییە، بێگیانە، بەرد و دارە، بۆیە وەڵامی نییە، یان هیچ کاردانەوەیەکی نییە، هەروەکو ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی (با) ناکات و بەردەوام دەبێت لەسەر قسەکردن، هەر بەوشێوەیەش چاوەڕوانی وەڵامی (حوجرەکە) ناکات تەنها لەلایەن خۆیەوە سەلامی بۆ دەنێرێت.

**سێهەم**: سەرەتا و کۆتا شوێن کە بای بۆ دەنێرێت دیاریکراوە، کاتێک نالی تەکلیف لە (با) دەکات بچێت بۆ سلێمانی بۆ هەواڵپرسین، جووڵەی (با) لەلای خۆیەوە دەستپێدەکات و لەناو حوجرەکە کۆتایی دێت، ئیتر کە دەگاتە ناو حوجرەکە ساکین دەبێت و لە جووڵە دەکەوێت و داوای لێ ناکات لەوێوە بڕوات بۆ شوێنێکی تر، بەڵکو هەر لەوێدا هەواڵپرسین و چامەکە کۆتایی دێت، تەماشای جووڵەی (با) بکەن لەلای نالی خۆیەوە هەڵدەکات تا دەگاتە (شێوە سوور)، بەڵام لەوێ ناوەستێت، بەڵکو دەینێرێت بۆ سەر چنار و بەکرەجۆ، دواتر دەینێرێت بۆ ناو شار، لەناو شاریش ناهێڵێت ساتێک بوەستێت، کۆڵان بە کۆڵان و شوێن بە شوێن دەیگێڕێت (سەرشەقام، شێخ عەباس، کانی ئاسکان، دەشتی فەقێکان)،  دواتر دەینێرێتە ناو مزگەوتی خانەقا، لەناو مزگەوتەکەشدا ڕایناگرێت هەتا دەیباتە ناو حوجرەکەی، بەڵام لە دوای ئەوێوە ئیتر جووڵەی (با) نامێنێت، لەوێدا دەوەستێت، تەنانەت کاتێک دەیەوێت (سەلامی دوور) بنێرێت بۆ (یاری سەنگ دڵ) پێی ناڵێت هەستە بڕۆ بۆ لای یاری سەنگ دڵ، بەڵکو پێیدەڵێت هەر لەوێدا سەلامەکە بگەیەنە، ئایا یاری سەنگ دڵ کەسێکە لەناو حوجرەکە دانیشتووە؟ نەخێر، چونکە کەسەکان ئامادە نین لەوێ، بەڵکو هەر خودی حوجرەکەیە، چونکە کە (با) دەگاتە لای و لەناویدا ئۆقرە دەگرێت ئیتر جووڵەیەکی تری پێویست نییە، پێویستە سەلامەکە بگەیەنێت و پەیامەکەی کۆتایی بێت.

**چوارەم**: قسەکردن بە چپە (خوفیە) بۆ دوو کەسە کە لە یەکەوە نزیک بن، لە بەیتەکەدا وشەی خوفییە هاتووە کە داوا دەکات سەلامەکەی بەوشێوەیە بگەیەنێت بە یاری سەنگ دڵ، خوفیەش وشەیەکی عەرەبییە و مانای لە قسەکردندا مانای نهێنی و چپە و ئەسپایی دەگەیەنێت، ئەم حاڵەش بێگومان لە نێوان دوو کەسدا دەبێت کە لە یەکەوە نزیک بن و کەمتر لە مەترێک نێوانیان بێت، واتە بە تەنیشتی یەکەوە بن، دروست لەوکاتەدا نالی داوای ئەو سەلام گەیاندنە لە (با) دەکات کە لەناو حوجرەکەدایە و گەیشتووەتە کۆتایی سەفەرەکەی، پێی دەڵێت حاڵی بکە و تێیبگەیەنە لە شوێنی خۆی، پێی ناڵێت برۆ سەلامەکەم بگەێنە یان لەوێش مەوەستە و برۆ تا سەلامەکەم دەگەیەنیت بە یاری سەنگ دڵ، بەڵکو داوای لێ دەکات هەر لەوێدا حاڵی بکات و بۆی ڕوونبکاتەوە کە لە تاسە و شەوقی ئەودا سەلامی دوور دەنێرێت.

> **دوای لێکدانەوە و وردبوونەوە لە چامەکە بۆم دەرکەوتووە، کە (یاری سەنگ دڵ) بریتییە لە (حوجرەکەی) نەک کەسێکی دیاریکراو و مرۆڤێک.**

**پێنجەم**: دەستەواژەی سەنگ دڵ واتە (لەبەرد دروستکراو) یان (سەنگین) نەک (دڵڕەق)، جەنابی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە مانای سەنگ دڵدا دەڵێت: دڵ ڕەق وەک بەرد، بۆ مانای بەیتەکەش دەڵێت: واتە بە دزییشەوە بە یاری دڵ ڕەق بڵێ لە ئارەزووی دیداری تۆوەیە نالی لە دوورەوە سەلام ئەنێرێ (١٩٧٦:١٩٧)، ئەمە واتایەکی سیاقییە کە لە لای شاعیرانی دیکە و لە سیاقی شیعری ئەو کاتەدا، یان لە ڕوانین بۆ پێکهاتەی وشەکەوە ئەو مانایە وەرگیراوە، کە سەنگ بە مانای (بەرد) هاتووە، بەڵام بە وردبوونەوە لە فەزای گشتی چامەکە و ئەو سیاقە زمانییەی ئەم وشەیەی هەڵگرتووە دەگەینە ئەنجامێکی دیکە، کە سەنگ دڵ مانای (دڵبەرد) واتە لەبەر دروستکراو دەگەیەنێت، واتا وشەکە مانای

حەقیقی خۆی دەدات نەک مانای مەجازی، کەواتە خواستن (استیعارە)ی تێدا نییە کە سەنگ دڵ خواسترابێت بۆ دڵ ڕەق و دواتر (بۆخواستراوەکە) لابرا بێت، بەڵکو وشەی (دڵبەرد) هەر خۆی واتە ئەو حوجرەیەی لەبەر دروستکراوە، ئەم واتای دووەمە زیاتر لەگەڵ سیاقی گشتی چامەکەدا دێتەوە، چونکە ئەگەر واتای دڵڕەق وەرگرین ئەوە ڕەهەندێکی نەرێنی هەیە و نالی گلەیی لە یارەکەی دەکات و پێیوایە دڵڕەق و بێ بەزەییە، بەڵام سەرجەمی چامەکە ئەرێنی و پێدانی سیفەت و پەسنی جوانە بە شوێن و کەسەکان، ناکرێ هەموو شتێک لە چاو و خەیاڵی نالیدا جوان بێت، بەڵام یارەکەی کە باشترینی ناو شتەکانی سلێمانییە نەرێنی و ناپەسند بێت، ئەو بە سلێمانی دەڵێت بۆ دەفعی چاوەزارە کە پێی دەڵێن شاری شارەزوور، چونکە شارەزوور سیفەتێکی نەرێنییە پاساوی بۆ دەهێنێتەوە، هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت:

**پێم دەڵێن مەحبوبە خێڵ و قیچە مەیلی شەڕ دەکا**

**خێڵ و قیچە یا ترازووی نازی نەختێ سەر دەکا**

لێرەدا کە لە غەریبیدا نییە ئاوا پاساو بۆ مەحبوبە دەهێنێتەوە، ئەی چۆن دوای چەند ساڵ غەریبی و دوورە وڵاتی و وەسفکردنی هەموو شتەکان بە جوانی کەچی یارەکەی بە دڵڕەق وەسف بکات؟

شەشەم: پێشتر بە حوجرەکەی دەڵێت (غاری یار)، چەند بەیتێک پێش ئەم بەیتە حوجرەکەی دەچوێنێت (ئەشکەوتی سەور) کە بۆ ئەویش خواستنێکی جوان دەهێنێت و لە هاوەڵێتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) و ئەبوبەکری سدیقەوە (ڕەزای خوای لێبێت) وەریگرتووە، کە یار و یاوەرێتی یەکترییان کردووە و تەنها دوو کەسیش بوون، ئەو پێی دەڵێت غاری یار، بۆیە حوجرەکەی دەچوێنێت بەو ئەشکەوتە و دوا لێزمەیەکی دڕێیەکی جوان دەخوڵقێنێت لە چۆڵ و هۆڵی و بوونی کەسانی نەیار و ناپەسند و بوونی خۆی و هاوڕێ و یارانی و ئەو گێڕانەوەیەی دەگوترێت مار داویەتی بە قاچی ئەبوبەکری سدیقەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، ئەوەی گرنگە لێرەدا بە حوجرەکەی دەڵێت غاری یار واتە حوجرەکە یاری خۆیەتی و ئەویش یاری حوجرەکەیەتی، کەواتە یار سەلامی دوور بۆ یاری دەنێرێت یارێک کە لەبەرد و گڵ دروستکراوە و ساڵانێک هاوڕێ و هەمنشینی یەکتری بوون.

حەوتەم: کۆتا بەڵگەش ئەوەیە ئەم بەیتەی کۆتایی تەواوکاری پێنج بەیتی پێش خۆیەتی، هەر لەویوە کە دەڵێت:

**واصیل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم**
**چی ماوە چی نەماوە لە هەیوان و تاق و ژوور**

هەتا دەگاتە کۆتا بەیت کە سەرجەمیان (شەش) بەیتن، هەموویان یەک گوزارشت و دەربڕینن، واتە دەکرێت بڵێین ڕستەیەکی درێژە لەو بەیتەوە دەستپێدەکات و بە بەیتی کۆتایی ئینجا تەواو دەبێت و مانای تەواوەتی دەبەخشێت، ئەگەر بمانەوێت کورتی بکەینەوە بەم شێوەیەی لێدێت:

((واصیل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم و حاڵی بکە و تێی بگەیەنە کە نالی لە تاسە و شەوقی تۆیە سەلامی دوور دەنێرێ)).

بەم شێوەیە دەگەین بە ئەنجامێک لە لێکدانەوە و ماناکردنی دەستەواژەی (یاری سەنگ دڵ)، تەنها بە پشتبەستن بە زمان و پەیوەندی نێوان وشە و ڕستەکانی دەقی چامەکە، ئەمەش یەکێک دەبێت لە بۆچوون و لێکدانەوەکان و دەچێتە سەر خەرمانی فراوانی ڕەخنەی شیعری نالی.

سەرچاوەکان

١- عبدالعزیز حمودة، المرایا المحدبة من البنیویة إلی التفکیک، سلسلة عالم المعرفة، الکویت، ١٩٩٨.

٢- رولان بارت، ترجمة منذر عیاشي، هسهسة اللغة، دار نینوی، دمشق، ٢٠١٥.

٣- مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، دیوانی نالی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.



**کۆکردنەوە و وەرگێڕانی**
**پ.ی.د. ڕەنجدەر محەمەد عزیز**

# پوختەی ڕاپۆرتەکان
# سەبارەت بە داگیرکردنی پێنجوێن

**تێبینی**: ئەم بابەتە بەشێکە لە زنجیرەی ڕاپۆرتێکی درێژی بڵاونەکراوە، کۆمەڵێک زانیاری ورد لەخۆدەگرێت سەبارەت بە ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەگشتی و ناوچەکانی هەورامان بەتایبەتی و ڕاپەڕین و ڕووبەڕووبوونەوەکانیان لە دژی دەسەڵاتدارانی ئێرانی، هەروەها پەیوەندییان بە ڕووداوەکانی بەشێک لە ناوچەکانی هەورامان و شارەزوور و سلێمانی لە باشووری کوردستان و جوڵانەوەی شێخ مەحمود. ڕاپۆرتەکە زیاتر زانیاری هەواڵگریی و ڕامیاریی و سەربازی دەگرێتەوە و بەشێکن لە دۆسێی وەزارەتی ئاسمانی بەریتانی و لەنێو ئەرشیفخانەی نیشتمانی، لە لەندەنی پایتەختی شانشینی یەکگرتوو پارێزراون، بەشێوەی هەواڵی ڕۆژانە لەلایەن نووسینگەی خزمەتی تایبەتی بەریتانی لە سلێمانی گوازراونەتەوە.

**پێنجوێن**

**٤٢/١**

**ڕێککەوتی: ١٩٢٧/٥/١**

**بۆ: ستافی ئاسمانی**

**لقی ‹ا›**

پوختەی ڕاپۆرتەکان سەبارەت بە داگیرکردنی پێنجوێن:

١- ئەم ڕووداوە سەرەکییەکانی لای خوارەوە سەبارەت بە جوڵانەوە دوژمنکارییەکان و هتد، باسی لە پێش داگیرکردن و دوای داگیرکردنی پێنجوێنی هەتا ئێستا کردووە.

٢- بۆماوەی چەند ڕۆژێک پێش هاتنی یەکەکان (سەربازییەکان) بۆ ناوچەی پێنجوێن، شێخ مەحمود بەشێوەیەکی چالاکانە خەریکی خۆئامادەکردن بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی پێشڕەوییەکەیان. ئەوەندەی کە بتوانرێت هەتا ئێستا بزانرێت، شێخ مەحمود ئاگاداری ئەوە نەبوو کە پێنجوین لە یەککاتدا بە سێ یەکە هەڕەشەی لێدەکرێت. هێزەکانی ناوبراو لە پێنجوێن ژمارەیان لە نێوان (١٠٠ بۆ ١٥٠) پیاو بوو، بۆ ئەوانەشی کە چاوەڕوانی ئەوەیان لێ دەکرێت ژمارەیەک تفەنگیان لە گوندنشینانی دەشتی پێنجوێنەوە کۆکردبێتەوە، دەبووایە ( ١٠٠ بۆ ١٥٠) تفەنگی تریان بۆ بهێنایە. وادیار بوو ئەم گوندنشینانە لە هیچ کاتێکدا پەرۆش نەبوون بۆ شەڕکردن، بەڵام ئەگەر دەرکەوتایە کە شێخ مەحمود سەرکەوتوو دەبێت لە مانەوەی لە پێنجوێن، ئەوا هیچ بەدیلێکیان نەدەبوو جگە لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا لە ترسی دەرئەنجامەکانی داهاتوو.

لە هەمان کاتدا مەحمود سەرقاڵی هەوڵەکانی بوو بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانییەکی تۆکمەتر لەسەر سنوورەوە. ناوبراو لە مەریوان و هەوراماندا هیوای ڕاستەقینەی بەسەرکەوتن هەبوو. هاتنی لەشکرەکان لە هۆزەکانی ئەم دوو ناوچە بەس بوو بۆ پتەوکردنی هەڵوێستی دانیشتووانی پێنجوێن و گوندەکانی دەشتەکان.

ڕەنگە جەوهەری ئەم کێشەی مەحمود توانای هێنانی مەحمودخانی کانی سانان و مەحمود خانی دزڵی بۆ ناو ڕێککەوتنێک هەبێت بۆئەوەی لەگەڵیدا کار لەسەر ئەم شکستەی ناوبراو بکەن - بە هەر هۆکارێکی دیاریکراو هێشتا ناتوانرێت بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە ئەوە دیاری بکرێت، بەڵام پێدەچێت ڕێگای سەرەکی بریتی بێت لە:

(ئە) بێتوانایی شێخ مەحمود لە هێنانی مەحمود خانی کانی سانان و دزڵی بۆ ڕێککەوتن لەسەر کێشەی زەوی و زار و دۆزینەوەی چارەسەرێکی دڵخۆشکەر بۆ داواکاری پارە لە نێوانیاندا، لە ئەنجامی ئەو دوژمنایەتیانەی کەساڵێک پێشتر لە نێوان مەریوان و هەوراماندا سەری هەڵدابوو. هەردووکیان دڵنیاییان داوە بە شێخ مەحمود کە ئامادەن پێکەوە کار بکەن و یارمەتی بدەن ئەگەر ناوبراو بتوانێت یەکێکیان ڕازی بکات مەرجەکانی ئەوی دیکەیان قبوڵ بکات. ئەمە کارێکی ئێرەیی پێنەبردنە بۆ شێخ مەحمود، کە ڕەنگە بۆماوەیەکی درێژ بۆی زەحمەت بێت چارەسەرێک بدۆزێتەوە.

(ب) هەڵوێستی بە ئاگایانەی کانی سانان، وادەردەکەوێت سیاسەتەکەی تا دەکرێت دیوە ڕاستییەکە بێت لای هەمووان.

(ت) لە پەیوەندی لەگەڵ (ب)ی سەرەوە - جوڵەی نزیکبوونەوەی فارسەکان بۆ ناوچەی مەریوان و ڕازاو.

مەحمود خانی دزڵی بە درێژایی ماوە ئامادە بووە پشتیوانی لە شێخ مەحمود بکات، بەڵام پێدەچێت هەر جوڵەیەکی بەرفراوانی هەورامییەکان بەرەو پێنجوێن بەبێ هاوکاری مەریوانییەکان، کە ناچار دەبوون خاکەکەیان بەکاربهێنن، سەرکەوتوو نابێت.

بەمشێوەیە ئەو هێزانەی کە دەبوو هێزی سەرەکی شەڕکەری ئەو بن، دەرنەکەوتن، هەرچەندە وادەردەکەوت کە ئاسۆی ڕێککەوتنێکی بنەڕەتی تا دوا سات لە بەردەمی شێخ مەحمودا بووبێت- پێدەچوو هەردوو لایەن بەشێوەیەکی یەکسان نیگەرانی ئەوە بووبێتن.

کاتێک لە ٢٠ی نیساندا، هێشتا زیادبوونی پشتیوانی لە هەورامان و مەریوان بەدی نەهاتبوو، شێخ مەحمود خۆی بۆ کشانەوە ئامادە کرد. ناوبراو ڕایگەیاند کە نیازی سوتاندنی پێنجوێنی هەیە لەبری ئەوەی نەکەوێتە دەستی عەرەبەکانەوە، بەڵام دانیشتووانەکەی توانیان قەناعەتی پێبکەن بۆ وەلانانی ئەم بیرۆکەیە. پاشان فەرمانی چۆڵکردنی پێنجوێنی دەرکرد و دانیشتوانەکەی دڵنیاکردەوە کە داگیرکاری حکومەت وەک ڕابردوو تەنها بەشێوەیەکی کاتی دەبێت. پاشان دانیشتووانەکەی شارۆچکەکەیان جێهێشت و چوونە گوندەکانی نزیک یان سەر سنووری ئێران، بەشێوەیەکی سەرەکی ڕۆیشتن بۆ باشماخ و قەڵوەزە. پێشەنگی دانیشتوانەکە ڕوویان کردە ئەوەی دواتریان.

٤. لە هەمان کاتدا شێخ مەحمود وازی لە بیرۆکەی بەکارهێنانی ئەم گرووپە بچووکانە نەهێنابوو، کە ئەمانە لەڕاستیدا هەوڵی ڕێگریکردن لە پێشڕەوی یەکەی سەربازی باشووریان دەدا.

مەجید ئەفەندی لەگەڵ (١٥٠) پیاودا لە نزیک پینجوێن مایەوە بۆ ململانێکردن لەسەر بەرزاییەکانی هەرزەلەی-کانی مانگا. هەروەها هێزی زیاتریشی لە هەورامان لەبەردەستدا بوو، کە لە ڕێگەی ئۆفیسە باشەکانی محەمەد ڕەشید وەیسەوە بەدەستهاتبوو، کە خودی خۆی ژمارەیەک تفەنگی دابینکردبوو، بەڵام هێزە سەرەکییەکەی لە گوندەکانی ناوچە شاخاوییەکانی عێراقەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی هێڵی ناڵپاریز و کەولۆس دابین دەکرا (وردەکارییەکان پێشتر بە وایەر [تەلەفۆن] خراونەتە ڕوو)، کە لە ژێر هەژموونی ناوبراودا بوون.

خودی شێخ مەحمود لە سەرەتادا کشاوەتەوە بۆ وەیسە، بەو هیوایەی کە ڕەنگە لە ئەگەری سەرکەوتنی سەرەتایی لە نزیک ناڵپارێز، دەکرێت هێرشی لاوەکی وەردە وردە بەشێوەیەکی بەرفراوان لەلایەن هەورامییەکانەوە پەرەی پێبدرێت. شکستی هێرشی هەورامان لە ٢٢ی نیسان بۆ نیشاندانی هیچ شتێک لەسەر یەکەی باشوور و دەرکردنی مەجید ئەفەندی لە بەرزاییەکانی هەرزەلەی-کانی مانگا لە ٢٣ی نیسان لەلایەن لیڤییەکانەوە لە دواوە، هەروەها فڕۆکەکان، بەدڵنیاییەوە کۆتایی بە هەر چەشنە پەرەسەندنێکی لەوشێوەیە لە هەورامانەوە هێنا. لە ٢٣ی نیساندا، هێزەکانی دوژمن بەشداربوون لە کشانەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی لە گوندەکانی هەورامانی عێراقەوە بەرەو ماڵەکانیان، چەتەکانی مەجید و ئەلمەجید و وەیسە بۆ وەیسە، تێکهەڵچوون. لە ٢٥ی ئایاردا شێخ مەحمود لەگەڵ ئەندامانی خۆی کشایەوە بۆ بەلەکجاڕ.

قۆناغی یەکەم کۆتایی هات.

وا مەزەندەکراوە کە تێکڕای هێزەکانی دوژمن کە تا ئەم کاتە بەشدار بوون ٣٥٠ کەس زیاتر نەبوون و بەم شێوەی خوارەوە پێکهاتبوون:-

(ئە) ١٥٠ کەس لە لایەن محەمەدی ڕەشیدی وەیسە، هەروەها لە گوندەکانی کۆڵێتان، دۆڵەسور، سیامێوە، زەنگیسەر، کوڵی گاپڵە لە مەریوان لە هەورامانەوە دامەزران لە ٢٢ی نیساندا بۆ هێرشکردنە سەر پشتەوەی دیفکۆڵ لە کانی سپیکە، هەروەها لە ٢٢ی نیساندا لە هێرشی دواوەی دیفکۆڵ لە کانی سپیکە دامەزرا و دیسانەوە لە بەیانی ٢٣ی نیساندا تاڕادەیەک بەرکەوتنیان لەگەڵ پیکێتی (یەکەی پاسەوانی) دواوەدا هەبوو لە قۆناغە سەرەتاییەکانی پێشڕەوی لە کەمپی ناڵپارێزەوە.

(ب) چەتەکانی (چەکدارەکانی) مەجید دەستیان گرتبوو بەسەر بەرزاییەکانی هەرزەڵەی-کانی مانگا لە ٢٤ی نیساندا، هێزەکەیان ئەوپەڕی ٢٠٠ کەس دەبوو.

ڕاپۆرتەکانی دیفکۆڵ و لیڤیکۆڵ و فرۆکە سەبارەت بە قوربانییەکان هێشتا زۆر جێگەی متمانە نین بۆ باوەڕپێهێنان.

(٥) لە دوای داگیرکردنی پێنجوێن بە هیچ شێوەیەک بۆ چەند ڕۆژێک هیچ ئاسانکارییەک دەرنەکەوت بۆ بەدەستهێنانی هەواڵی ئەوەی کە چی ڕوودەدات لە پشتەوەی سنوور. هەرچەندە لە ٢٥ی نیسان ژمارەیەک موختاری گوندەکانی دەشتی پێنجوێن هاتبوونە ناوەوە بۆ هەواڵناردن، (مەسعود، قزڵجە، عومەر سینار)، دیار بوو ئەمانە بەهۆی ئەو تیڕوانینە گشتییەی کە داگیرکردنەکە تەنها بۆ ماوەیەکی کاتی دەبێت، ئامادە نەبوون زۆر بڵێن. حەمە ڕەشیدخانی بانە-پیاوێکی تاڕادەیەک گرنگ لە گۆشەی باکووری ڕۆژهەڵاتی ناوچەی پێنجوێن، لە ٢٥ی نیسان هاتبوو. ناوبراو هەواڵەکانی سەبارەت بەنیازی ئێران بۆ داگیرکردنی مەریوانی هێنا، بەڵام هیچ زانیارییەکی لەسەر شێخ مەحمود و بزووتنەوەکەی نەبوو. سەرئەنجام، لە ٢٧ی نیسانەوە تائێستا ڕێژەیەک لە دانیشتووانی پێنجوێن لە پاوە و باشماخەوە هاتوونەتە ناو سەربازەکانەوە. ئەمانە هەموو شەوێک دەگەڕێنەوە بۆ پەناگە کاتیەکانیان، کە سەرچاوەیەکی زانیاری بەنرخن بۆ شێخ مەحمود و لایەنگرانی سەبارەت بە ڕووداوەکان و جوڵەکان لە پێنجوێن. لەوێ و لە سەرچاوەکانی تری گوندەکان بڕێکی دیاریکراو لە زانیاری سەبارەت بە بزووتنەوە و هتد، لەلایەنی ئێرانەوە بەدەستهاتووە، کە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەمە لە خوارەوە کورتکراونەتەوە.

(٦) دوای کشانەوەی بۆ بەلەکجار لە ٢٥ی نیسان، شێخ مەحمود بەردەوام بوو لە چالاکییە سیاسییەکانی لەوێ، لە نێوان ٢٥ی و ٢٨ی نیسان. ئەمانەی خوارەوە سەردانیان کرد بۆ کۆنفرانسەکان، دزڵی، بەگزادەی ڕازاو (حسێن خان و ئەوانیتر)، محەمەد ڕەشید وەیسە.

ئەگەر کەسێک بتوانێت ئەو ڕاپۆرتانە قبوڵ بکات کە تائێستا وەرگیراون، ئەوا بۆچوونی ناکۆک لەم کۆبوونەوانەدا زاڵ بووە.

مەحمود خانی دزڵی ئامادەیە بۆ پشتیوانیکردن لە شێخ مەحمود (ئەگەر هێرش بکاتە سەر پێجوێن)، ئەگەر بێتو شێخ مەحمود بتوانێت ڕەزامەندی مەحمود خانی کانی سانان بۆ مەرجەکانی مەحمود خانی دزڵی بەدەستبهێنێت. لە ڕووداوێکی لەم چەشنەدا، لەشکری یەکگرتووی مەریوان و هەورامان پێشکەش بە شێخ مەحمود

دەکرێت، لە لایەکی دیکەوە مەحمود خانی کانی سانان لەمکاتەدا لە نووسینێکی بۆ (ڕۆژانەی) پێنجوێن، دۆستایەتی خۆی بۆ حکومەت و پچڕانی تەواوی پەیوەندی بە شێخ مەحمودەوە دەربڕی.

لەم نێوەندەدا بەگزادەی ڕازاو زیاتر لە خەمی نزیکبونەوەی هێرشی ئێران بوون وەک لە گرنگیدان بە کاروباری شێخ مەحمود، هەروەها پێدەچێت ئەوان بەشێوەیەکی سەرەکی لە شێخ مەحمود نزیک ببنەوە لەگەڵ بیرۆکەی بەکارهێنانی کاریگەرییەکانی بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی هەردوو لایەنی مەحمود خانی دزڵی و کانی سانان لە دژی پێشڕەوی فارسەکان.

لەم تێکەڵبوونی ئاواتانە لەلایەن ئەوانەی کە بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەندییان پێوە هەیە، پێدەچێت هیچ ئەنجامێکی دیاریکراو پەرەی نەسەندبێت کاتێک بەگزادەی ڕازاو و دزڵی لە بەلەکجاڕ بەجێهێشت لە ٢٨ی نیسان. گومانی تێدا نییە کە هەروەکو لە هەندێک سەرچاوەدا هاتووە، شێخ مەحمود بەشێوەیەکی سەرەکی سەرقاڵی هەوڵدان بووە بۆ کۆکردنەوەی هێزێکی پێویست لە دزڵی و ڕازاو بۆ کۆنترۆڵکردنەوەی پێنجوێن.

فاکتەری سەرەکی لە بەڕێوەبردنی سەرکەوتن لەم بابەتە پێدەچێت ئەوە بێت، کە ئایا لەڕاستیدا یەکەی فارسی خەریکە دەچێتە ناوچەی مەریوان و ئامانجە ڕاستەقینەکەی چییە.

لەوانەیە هەندێک پشتڕاستکردنەوەی ئەم هەواڵە لە بەغدا بەردەست بێت و یارمەتییەکی بەرچاوی ئەو هەوڵانە دەدات کە لێرە دەدرێن بۆ بەرزنرخاندنی بەهای هەواڵەکان لە دەرەوەی سنوورەوە، ئەگەر لە ئارادا بێت. جگە لەو ڕاپۆرتانەی پێشتر وەرگیراون، هەندێک ئاماژە هەیە بۆئەوەی کە جوڵەی ئێران نییەتەکەی بەرەو مەریوانە. ئەوانیش:

(یەکەم) ئایا پلانی ئاشکرای کانی سانان بۆ ڕاکێشانی سەرنجی دەسەڵاتدارانی عێراقە؟ هەرچەندە بڕوا وایە کە پێشتر ئەمە ڕوویدابێت.

(دووەم) ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لەم دواییانەدا (لە ٢٩ی نیسان) کانی سانان کوڕەکەی ناردووە بۆ سنە هەتا ملکەچی خۆی بۆ حکومەتی ئێران نیشان بدات.

بڕوا ناکرێت کە ناوبراو دژایەتی هێزەکانی ئێرانی کردبێت و ئەگەری ئەوە هەیە کە حکومەتی ئێران تەنیا ویستبێتی مەریوان بکاتە بنکەیەک بۆ ئۆپەراسیۆنەکانی دژی ڕازاو.

ئەگەر ئۆپەراسیۆنەکانی ئێران کاریگەر بن، پێویستە بارودۆخی ئەودیوی سنوور کە ناوەندەکەی نزیکە لە شێخ مەحمودەوە لە بەلەکجارِ، بەشێوەیەکی بەرچاو باشتر بکات.

لە ئەگەری نەبوونی پێشهاتێکی لەو شێوەیە، یان لەلایەکی دیکەوە بەپێچەوانەیەکی ئێرانی، ئەوا سەرکەوتنی شێخ مەحمود لە پیکهێنانی هێزی هەورامان (هەروەها پیدەچێت ڕازاو) بۆ هێرشکردنە سەر پێنجوێن، بەشێوەیەکی دیار ئەگەری ئەوە هەیە، تەنانەت ئەگەر لە ڕێگەی هاوکاریی مەحمود خانی کانیسانانەوە بێت، ئەوانیش ناچارن لە باشوورەوە کاربکەن.

**ج.م. مۆر**

**ئەفسەری خزمەتی تایبەت، پێنجوێن.**

..........................................................................................

**پاشکۆ**

**لەگەڵ ئاماژەدان بە پەرەگرافی ٤ی هاوپێچکراو.**

دەبێت باس لە چالاکییە ئاسمانییەکانی سەرلەبەیانی ٢٣ی نیسان بکرێت.

وادادەنرێت کە شێخ مەحمود لە ڕۆژهەڵاتی ناڵپاریزەوە هیوایەکی بەرچاوی لەسەر پەرەپێدانی هێرشەکەی هەڵچنی بێت. هەرچەندە بە بەراورد هێزێکی کەم بەکارهێنرا لە هێرشی سەرەتاییدا (کە لە گوندەکانی هەورامانەوە هاتبوون)، ئەگەر ئەمانە سەرکەوتوو بوونایە لە بە جددی کاریگەری کردنە سەر جوڵەی یەکەکە، ئەوا هێزی پشتیوانی لە وەیسە و لایەنی ئێرانەوە بە خێرایی دەگەیشتن.

لەم حاڵەتەدا ئەو شێوازەی کە فڕینی ٣ فڕۆکە بەشی دواوەی پیکۆتەکانیان لەکاتی کشانەوەیاندا داپۆشی لە بەرزاییەکانی ناڵپارێزەوە لە نێوان کاتژمێر ١١.٣٠ بۆ ١٢.٣٠، کە شایەنی هەندێک سەرنجە کە لە ٢٣ی نیسان. ئەم پیکێتانە پێشتر پەیوەندی دوور مەودایان لەگەڵ لایەنەکانی دوژمن هەبووە (واتە ئەوانەی کە لە ٢٢ی نیسان هێرشیان کردبووە سەر پاسەوانی دواوە)، لە کاتی کشانەوەیان بۆئەوەی بچنە پشتەوەی یەکەی سەرەکی، پاشان لە بناری خوارەوەی کانی مانگا، ئەگەری ئەوە هەبوو کە دوژمن لە نزیکەوە بەدواداچوون بکات و تووشی بەشی دواوەی یەکەکە بێت. سەرکردەی فڕینەکە دۆخی ناوخۆیی زۆر بە وردی

بەرز نرخاند و ٣ ئامێرەکەی جوڵەیەکی داپۆشینی زۆر باشیان ئەنجامدا، لە نزیکەوە بەرزاییەکانیان لە دوای کشانەوەی پیکۆتەکان بۆردومان کرد و دواتر بە تەقەی دۆشکە گردەکانیان ئاوپەرژێن کرد. بەوشێوەیە، کاریگەریەکەیان ڕێگری دەکرد لە هەر بەدواداچوونێک لەلایەن دوژمنەوە و درێژەی بەم چالاکییەدا هەتا هەموو سەربازەکان لە دوڵەسوور پەڕینەوە. هەموو ئەوانەی پەیوەندیدار بوون لەو ئۆپەراسیۆنە تایبەتەدا، ئەو ڕێکوپێکی و وردبینییەی فڕۆکەی ئەنجامدەری مانۆڕەکەیان بەرزنرخاند.

**ج.م. مۆر،**

**ئەفسەری خزمەتی تایبەت، پێنجوێن.**

.............................................................................................

**پاشکۆ**

**داڕشتنەوە، نهێنی، نووسینگەی ڕامیاری، گرنگ**

**بۆ : تاران**

**٨٥٣/١**

کشانەوەی شێخ مەحمود و شوێنکەوتووەکانی بۆ سەر سنوری ئێران بۆ بەلەکجاڕ و دەوروبەری دوا بە دوای داگیرکردنی پێنجوێن بوو لە لایەن ئێمەوە لە ٢٢ی نیسان.

(٢) گوایە بە ئامانجی دژایەتیکردنی یەکەی ئێرانی چاوەڕوانکراو لە سنە، لە ٢٨ی نیسان، باس لەوە دەکرێت کە لە کۆنفرانسێکدا کە لە نێوان سەرۆکەکانی ڕازاو و مەحمودخانی دزڵی و شێخ مەحمود بەڕێوەچووە، هەندێک ڕێککەوتنی هاوبەش هاتووەتە ئاراوە.

(٣) لە پەیوەندی لەگەڵ ئەوانەی پێشوودا، شتێکی زۆر سەرنجڕاکێش ئەوەیە، هەرچەندە دەزانرێت کە گوایە هێرشی ئێران ئاڕاستەی سەرۆکەکانی مەریوان کراوە، بەڵام دەوترێت مەحمودخانی کانی سانان ڕەتیکردۆتەوە بەشداری بکات.

(٤) پێدەچێت ئەو ئامانجەی کە گوایە ڕێککەوتن دەکرێت، تەنیا پەردەیەک بێت بۆ داپۆشینی هەندێک پرۆژە کە ئاڕاستەی سەربازەکانمان کراوە لە ناوچەی پێنجوێن.

(٥) ئایا هیچ ڕاستییەک هەیە لە ڕاپۆرتی دەرچوونی یەکەی ئێران لە سنەوە لە ٢٨ی نیسان؟

(٦)تکایە هەر زانیارییەکی هەواڵگری لەبەردەستدایە، هەروەها زانیاری سەبارەت بە ئۆپەراسیۆنەکانی ئێستای ئێران و ئەوانەی بەم نزیکانە ڕوودەدەن لەم ناوچەیەدا، ڕەوانە بکەن (بە سیم). ئایا دەتوانین هیوامان بە هاوکاری ئێرانییەکان هەبێت، یان پێشبینی پێچەوانەکەی بکرێت.

**نێردرا لە ٣٠ نیسان**

**ج.ڕ.هـ**

**لە: فرۆکەوانی، بەغداد**

............................................................................................

**پاشکۆ**

**داڕشتنەوە، نهێنی، لە تارانەوە، گرنگ**

**بۆ : فرۆکەوانی بەغداد**

**٢٣٧/١**

کۆبوونەوەی ئەم دواییەی نێوان شێخ مەحمود و مەحمودخانی دزلی و سەرکردەکانی ڕازاو لە بەلەکجاڕ لە تایبەتمەندییە دیارەکانی بارودۆخی ئێستایە، هەروەها بە هاوپەیمانییەک بۆ هەندێک مەبەستی هێرشبەرانە، کە بە ڕواڵەت ئاڕاستەی یەکەی ئێرانی کردووە، گەیشتووەتە لوتکە. بەڕای من ئەمە وانییە و دەرئەنجامەکەش ئەوەیە کە هاوپەیمانییەکە ئامانجی دژایەتی ئێمەیە، مەگەر ئەوەی لە سەرچاوەی دیکەوە پشتڕاستکردنەوەتان هەبێت کە یەکەی ئێرانی لە سنەوە جوڵا بێت.

**ج.ڕ.هـ**

**٢٩ ی نیسان**

**لە: تایبەت، پێنجوێن.**

**پاشکۆ**

**دارِشتنەوە، نهێنی، لە تارانەوە، گرنگ**

**بۆ : فڕۆکەوانی بەغداد**

**٢٣٣/Y**

لە ٢٥ی نیسان، حەمەڕەشید باس دەکات کە ئاغا نووری لێپرسراوی ئێرانی سەردانی کردووە، هەروەها دوای ئەوە وتوویەتی کە ئۆپەراسیۆنی داهاتوو دژی مەریوان و کانی سانان دەبێت و بۆ ئەو مەبەستە داوای یارمەتی کردووە. حەمە دەڵێت: یەکەیەک کە هێزەکەی نازانریت بەیانی لە سنەوە دەجولێت، هەربۆیە وادیارە کە نیەتەکە داگیرکردنی مەریوانە. ئەوەی سەرەوە ئاماژەیە بۆ ئەو ئۆپەراسیۆنانەی کە پێشتر لەلایەن ئێرانەوە دژ بە یازوو ئەنجام دراون.

**ج.ڕ.هـ**

**٢٨ی نیسان**

**لە: تایبەت، پێنجوێن.**

..........................................................................................

**پاشکۆ**

**دارِشتنەوە، نهێنی، لە تارانەوە، گرنگ**

**بۆ : فڕۆکەوانی بەغداد**

**٢٢٨/Y**

هەر هەواڵێک کە بەڕادەی پێویست گرنگ و ورد بێت سەبارەت بە جوڵەکانی دوژمن، ئەوا بۆم دەناردن (بە سیم)، بەڵام هەتا ئەمڕۆ نیە. جگەلەوەش من بەو گریمانەیە مامەڵەم کردووە، کە لەکاتێکدا لە جوڵەدان، فەرماندەی هێزەکە دەیەوێت ئاگاداربن لە بارودۆخەکە. ژمارە ٨٥٢/١ تان لە ٢٥ نیسان.

هەر هەواڵێکی دیکە کاتێک کە وادابنرێت بە ئەندازەی پیوێست وردە، بۆتان دەنێرم. بڕوانە نێردراوەکەی دوینێم کە لە ڕێگەی ئاسمانییەوە ڕەوانەکراوە.

**ج.ڕ.هـ**

**٢٦ی نیسان**

**لە: تایبەت، پێنجوێن.**

**پاشکۆ**

**دارپشتنەوە، نهێنی، لە تارانەوە، گرنگ**

**بۆ : فرۆکەوانی بەغداد**

**٨٥٢/١**

لە ماوەی ئۆپەراسیۆنەکان لە ٢٠ی نیسانەوە، ئێمە هیچ هەواڵێکمان لە تۆوە بە هیچ شێوەیەک بەدەستنەگەیشتووە. بەیەکجار هەمووی بەتەواوی بنێرە. ئێوە بە بێئاگایی تەواو لە بارودۆخی گشتی و جوڵەکانی مەحمود، هەروەها سەبارەت بە هێز و مەیلی دوژمن و پێکهاتەی دوژمن بارەگاکانتان بەجێهێشتووە.

**ج.ر.هـ**

**٢٥ی نیسان**

**لە: تایبەت، پێنجوێن.**

ژیاننامە، ئەوەیە کە ئەمڕۆ (بەژیاننامە)، (سەرگوزەشتە) یان (شەرحی حاڵ) ناوی دەبەین و لە مێژووی ئیسلامیدا بە (تەرجومەی حاڵ) و لە مێژووی ئێرانیشدا بە (کارنامە) ناودەبرێت. دەتوانین دەستپێکی مێژووی نووسینەوەی ژیاننامە بگێڕینەوە بۆ سەردەمی ساسانی و ئاماژە بە (خودایی نامە) و کارنامەی ئەردەشێری بابەکان بکەین.

تەنانەت دەکرێت لەوەش زیاتر بگەڕێینەوە بۆ قوڵایی مێژوو، نووسراوە بەردینییەکان و نووسین بە خەتی هێرۆگلیفی نێو پەرستگاکان و گۆڕستانەکانی میسر، یان نووسینی سەر بەردەکان بە زمانی بزماری لە کۆشکەکانی ئاشوور، یان نووسراوی کەتیبەکانی شاخی بێستون بە دەستپێکی ئەم جۆرە نووسینانە بزانرێت.

ئەوەش ڕوونە کە لە قۆناغە کۆنەکاندا ئامانج لە نووسینەوەی ئەم جۆرە نووسینانە تاڕادەیەک بۆ بە گەورەیی نیشاندانی فەرمانڕەوایان و کەسانی ناودار بووە، هەربۆیە لەسەر بنەمای دیاریکردنی ئەم جۆرە ئامانجی نووسینە، نووسینەوەی ڕاستی لەنێو ژیاننامەکاندا تاڕادەیەکی کەم بەدی دەکرێت. لەنێو مێژووی ئیسلامیشدا، نووسینەوەی ژیاننامە دەمانگێڕێتەوە بۆ کتێبەکانی سیرە (ژیانی پێغەمبەر و یارانی)، کە لە سەردەمی ئیسلامدا ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەواڵ و فەرموودانەی کە لە لایەن هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) و شوێنکەوتووانەوە گێڕدراونەتەوە.

لە نموونەی زیاتری ئەم جۆرە نووسینانە ژیاننامەی مێژوویی کەسانی ناوبانگ و عارف و ئەولیاکانن کە نموونەی دیاریان وەک: (اسرار التوحید در شرح ابوسعید ابوالخیر بە فارسی) و هەروەها (تذکره الاولیا)ی عەتار بە فارسی و ژیانی سوڵتانەکان. هەروەها بەپێی ئەو قۆناغەی مێژووییەی کە تێیدا بوون، زیاتر ژیانی پێغەمبەران، ئەولیا، عارفەکان، ژیاننامەی خەلیفە و فەرمانڕەوایان گرنگی پێدراوە. نووسەرانیش لەو قۆناغەدا ڕووی ڕاستەقینەی ڕووداوەکانیان زیاتر بەشێوەی ئەفسانەیی ئاڕاستە کردووە.

لەنێو نووسینەوەی ژیاننامەی فەرمانڕەوایان، دەکرێت ئاماژە بکرێت بە کتێبی (تذکره)ی شا تەهماسب یان (تاریخ شاه طهماسب) کە بە پێی گێڕانەوەکانی خۆی و بە زمانی فارسی نووسراوە. هەروەها هەندێک لە زانایان و دانایانی موسوڵمانی

ئێرانیش، ژیاننامە و شەرحی حاڵی خۆیانیان نووسیوەتەوە، دیارترین نموونەش وەک: (المنقذ من الضلال)ی محمد غەزالی کە دەتوانرێت بە یەکێک لە شێوازی نووسینی (دانپێدان) و خودنووسەکان دێتە ئەژمار[1]. ئەبوو عوبەیدی جوزجانی نامەیەکی لەبارەی ئیبن سیناوە هەیە کە بەشی یەکەمی لە زمانی خودی ئیبن سیناوە گێڕاویەتییەوە.

لە ژیاننامەکانی یۆنانی کۆندا، بەپێی باوەڕە کۆنەکانی یۆنان، ئەوە چارەنووسە کە جەختی لێ دەکرێتەوە نەک خودی کەسەکە، هەربۆیە لەنێو ئەوانەشدا دەبینین کە واقعییەت و فەنتازیا پێکەوە ئاوێتەکراون. هەروەها دەتوانین ژیاننامەنووسیی لە بەرهەمەکانی ئیسوکراتس و گەزنەفۆن کە لە سەدەی پێنجی پێش زایین نووسراون شێوازی پێداهەڵدان و ستایشیان تێدا بدۆزینەوە و بەڕوونی تێیاندا ببینرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، دەتوانین بۆ ئاماژەدان بە سەرەتاییترین نووسینەوەی ژیاننامەنووسی کەسانی ئاسایی، ئاماژە بە گفتوگۆکانی ئەفلاتوون لە سەدەی چوارەمی پێش زایین و ئینجیلەکانی پەیمانی نوێ لە دوو سەدەی یەکەمی زایینی بکەین، ئەگەرچی بە نییەتی ستایش و پێداهەڵدان نەنووسراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سوودێکی ئەوتۆیان لە شێوازی ڕەخنە و بابەتی گێڕانەوەی وەرنەگرتووە.

پلوتارکی یۆنانی لە سەدەی دووهەمی زایینی، لە کتێبەکەیدا بەناوی ژیانە پێکەوەییەکان، یا بەپێی ئینسایکلۆپیدیا، ژیاننامەی بەراوردکراو، پێوەری بەراوردکردن و هاوتەریبی بەکاردەهێنێت. پلوتارک لە کتێبەکەیدا (پوختەی کتێبەکەی لە تاران بە زمانی فارسی چاپکراوە بە ناونیشانی: حیات مردان نامی در ۱۳۳٦- ۱۳۳۸) بەپشتبەستن بە میتۆدی بەراوردکاری، باس لە ژیانی کەسانی بەناوبانگی یۆنان و ڕۆم دەکات و پەیوەندی پێوەرە ئەخلاقییەکان و دەستکەوتە دونیاییەکان هەڵدەسەنگێنێت بۆئەوەی لە کۆتاییدا بگات بە دەرەنجامێکی ئەخلاقی فێرکاری. دوو سەدە دواتریش، قەشە ئۆگستین لە دانپێدانانەکانی خۆیدا، ڕەفتار و کردارەکانی خۆی لە پێش باوەڕهێنان بە مەسیحی و دوای باوەڕهێنان بەراورد دەکات و بەو پێوەرانەی کە خۆی هەیەتی، هەڵیاندەسەنگێنێت.

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە ئەورووپا نووسینەوەی ژیاننامەی شەهیدان و کەسانی بەناوبانگ و پیاوانی ئایینی ڕەونەق پەیدا دەکات، بەڵام هێشتا لەسەر بنەمای

سادەیی و ڕواڵەتاسازیی و خۆشباوەڕییە و بنەمای باوەڕ و ڕاستی کەسایەتییەکان نادیدە دەگیرێت. لەم شێوازی نووسینەدا، ڕەخنەکان و خراپەکارییەکانی مرۆڤ و ڕووداوە ڕاستەقینەکان بە نەگوتراوی دەمێننەوە، بۆئەوەی زیاتر ڕووداوە باشەکان و بەموعجیزەکردنی پیاوانی ئایینی و کەسانی بەناوبانگ ڕەونەقی پێ بدرێت، بەڵام لە ئەوەشدا و هەر لەم قۆناغەدا، دانە دانە نووسینەوەی ژیاننامەی کەسانی نا ئایینی دەردەکەون، وەک: ژیانی شارلەمان لە نووسینی ئایین هارد لە سەدەی نۆیەم نووسراوە، کە لەگەڵ خستنەڕووی ڕاستەقینەیی کەسایەتی و ڕووداوەکان و هەڵسەنگاندنیان، گرنگی و بایەخ بۆ بابەتی ژیاننامەنووسی دەگێڕێتەوە. لە ساڵانی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست، ژیاننامەی پاشایان، کەسانی لێهاتوو و تەنانەت ترسنۆکەکانیش بازاڕ پەیدا دەکات. لە نموونەی ئەم جۆرە کارانەش دەتوانرێت ئاماژە بە (شهسواران میزگرد)ی تامس مالوری بکرێت.

لە سەردەمی ڕێنسانسیش، (کەم تا زۆرێک لە سەدەی چواردە تا سەدەی شانزدە و حەڤدە) بەوپەڕی وابەستەبوون بە دەسەڵات و هێزی دونیاییەوە ئارەزوومەندی بۆ خۆدەرخستن دێنێتە کایەوە، هەربۆیە لەم قۆناغەدا نووسین لەبارەی شاعیران و هونەرمەندان دەبێتە باو و کەسێکی وەک: جۆرجۆ وازاری، وێنەکێشی ئیتالیایی ژیانی هونەرمەندان (١٥٥٠) دەنووسێت.

هەر لەم ماوەیەدا ژیاننامەی بینڤینوتۆ چیلینی (Benvenuto Cellini) پەیکەرساز، فلزکار و نووسەری سەدەی شانزەی فلۆرانس، نموونەیەکی دیاری لەم جۆرە نووسینانەیە. بیرەوەرییەکانی (سان سیمۆن) کە تێیدا بە باسکردن و خستنەڕووی دەرباری (لویسی چواردە) لە ڤێرسای لە سەدەی حەڤدەیەم، کاریگەری ڕەهای هێزی سەڵتەنەت بەسەر ژیانی خەڵکییەوە ڕووندەکاتەوە. هەر لە سەدەی حەڤدەیەمدا، لە بەریتانیاش بەرهەمی نووسەرانی وەک: ساموێل پێپس (Samuel Pepys)، ئێڤلین (Evelyn)، ئایزەک واڵتن (Izaak Walton)، شێوازێکی نافەرمی و سادە، لە ژیاننامەنووسیدا بەکاردەهێنن.

بەمشێوەیە، بەگەیشتن بە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدە و هەژدە و دەستپێکردنی سپێدەی سەردەمی ڕۆشنگەری، کە وردەکاریی و گوتنی ڕاستییەکان زیاتر گرنگی پێ دەدرێت، شێوازی ژیاننامەنووسیش، گۆڕانکارییەکی بەرچاو بەخۆیەوە دەبینێت.

ئەم شێوازە نوێیە لە نووسینە دیارەکانی ئەوکاتە، وەک: ژیانی سیمۆ ئێل جانسن (١٧٩١ز) لە نوسینی جێمس بازوول(Boswell)، کە بە یەکەم ژیاننامەنووسی مۆدێرن دێتە هەژمار، یان لە ژیاننامەی بنیامین فرانکلینی ئەمریکی کە ڕاستی و واقیعییەتی زیاتر تێدا دەردەکەوێت. یان لە دانپێدانانەکانی جان جاک ڕۆسۆی فەڕەنسی (ساڵی ١٣٢٨ وەگێڕدراوە بۆ سەر زمانی فارسی)، ڕاستگۆیی و ڕاشکاوێتی زیاتری تێدا دەبینرێت.

لە سەدەی نۆزدە بە دواوە، شێوازی نووسینەوەی ژیاننامە زیاتر دەبێت و تەنانەت ژیاننامە نووسی گرووپیش، ڕەواج پەیدا دەکات. لەنێو ئەو بەرهەمە زۆرانەی ئەو سەدەیەشدا دەتوانین ئاماژە بە: هۆنراوە و حەقیقەتی گۆتە، نووسینەکانی تامس کارلایلی ئینگلیزی، یان ژیانی عیسایی ئەرنێست رینان، بکرێت.

شیاوی باسە کە کارلاییل ژیاننامەنووسی بە بەشێک لە نووسینەوەی مێژوو دەزانێت و تێڕوانینەکانی کاریگەرییان هەبووە لەسەر شێوازی نووسینەوەی ژیاننامە لە ئەمریکادا. بەدەستپێکردنی سەدەی بیست و هەبوونی کەسایەتی وەک: فرۆید، کە بابەتی ناخودئاگایی و لا ئیرادی باس دەکات، دەروونشیکاری دێتە نێو ژیاننامەنووسییەوە، نووسینێکی خودی فرۆید بە ناوی (لیۆناردۆ داڤینشی، ١٩١٠)، نووسینەکانی ئاناییس نین (Anais Nin)،(١٩٣١- ١٩٤٤) لە هەمان شێوازی نووسین دێنە هەژمار.

لەم کاتانەدایە کە لیتۆن ستراجی (Lytton Strachey)، بە نووسینی بەرهەمێکی جەنجاڵاوی وەک: (ڤیکتوریای های برجستە، ١٩١٨، ملکە ڤیکتوریا ١٩٢١) شۆڕشێکی گەورە لە شێوازی ژیاننامەنووسیدا هەڵدەگیرسێنێت و نووسینەوەی ژیاننامە لە کۆت و بەندی پیاهەڵدان و باڵۆرەگوتن ڕزگار دەکات.

جێگای باسە لەم سەدەیەدا، ژمارەی شاعیران و نوسەران کە خۆیان بۆ نووسینەوەی ژیاننامەی کەسانی دیکە تەرخان کردووە زیاتر دەبێت، بۆ نموونە: کارل سندبرگ، لویس ئانتەرمایەر (Louis Untermeyer) یەکێک لە کتێبەکانی بەناوی: (آفرینندگان جهان نو/ بنیاتنەرانی دونیای نوێ، لە ساڵی ١٣٧٢ لە تاران چاپ بووە)، ئەندرا مۆرە، ئاشفتن تسوایگ، ئەمیل لودویگ، ئایروینگ ستوون، ڕومن ڕولان، ئەندرا مالرو، سیمون دوبوار و ڕولان بارت.

توانای گۆڕانکارییەکان لە سەدەی بیستدا لە شێوازی ژیاننامەنووسیدا بە

ڕوونی دەردەکەوێت و تەنانەت لە ئێرانیشدا کاریگەری دادەنێت و بازدانێکی دیار لە سوننەتی نووسینەوەی ژیاننامەدا ئەنجام دەدرێت. ئەم قۆناغەش هاوکاتە لەگەڵ هوشیاربوونەوەی ئێرانییەکان و ئاشنابوونیان بە دەستکەوتەکانی جیهانی مۆدێرن و قۆناغی کۆتاییەکانی سەردەمی قاجار و دەستپێکی شۆڕشی دەستووری لە ئێران و دەست بە قەڵەم گرتنی نوخبەکان و نووسەرانی ئێران، دەستپێکی نوێیە بۆ نووسینەوەی مێژوو، مێژوونووسی و تۆمارکردنی ڕووداوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان لەو وڵاتەدا[٢].

ئەوەش ڕوونە کە ئەم هەنگاوە گرنگە لە ئەنجامی پێویستی و هەوڵدانە بۆ دووبارە خودناسی، هەروەها پاڵنەری گەیشتن بە شوناسی کۆمەڵایەتی و نیشتمانی ڕۆڵی تێدا دەبینێت، تروسکایی ئەم بۆچوونە تازە و نوێیەش، لە زیادبوونی نووسینەوەی سەرگوزەشتە و یادگارییەکان دەبێت، لەو قۆناغەدا چەندین کتێب بە پێنووسی پیاوانی دەوڵەت و بیریاران لە شێوازی ژیاننامەنووسی، بیرەوەری و یاداشت دەنووسرێنەوە[٣]. هەندێک لە دیارترینی ئەو کتێبانەش وەک: خاطرات اعتماد السلطنه، خاطرات تاج السلطنه، شرح زندگانی من لە نووسینی عەبدوڵڵا مستەوفی (١٢٥٥- ١٣٢٩هەتاوی)، زندگانی من لە نووسینی ئەحمەد کەسرەوی (١٣٢٤ هەتاوی).

دواتریش هەر بەوشێوەیەی کە دەزانرێت و ڕوویداوە، زەمینە و پاڵنەر بۆ نووسینەوەی یادگارییەکانی جەنگ و زیندان، زەمینەیەک دێنێتە پێشەوە کە بەردەوام ژیاننامەنووسی ڕوو لە فراوانی دەکات، لەگەڵ ئەوانەشدا پاڵنەرە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکان کە دەبنە هۆی پەیداکردنی بازاڕی ژیاننامەنووسی و یادەوەری نووسی، گرنگی زیاتریان هەیە.

ئەوەش لەبیر ناکرێت کە ئەو شەپۆلە جیهانییەی لەبارەی نووسینەوەی ژیاننامەنووسی و بەتایبەت لقی بیرەوەرییەکان، ڕۆڵێکی دیاری هەبووە لە گرنگیدان و فراوانکردنی ژیاننامەنووسی و فراوانکردنی بازاڕی کتێبی فارسی.

هەربۆیە دەبینین، کە ئەم جۆرە لە شێوازی نووسینی ژیاننامەنووسی یان یادداشت و بیرەوەری چ ئەوانەی لەناو ئێران یان ئەوانەی لە دەرەوەی ئێران بڵاودەکرێنەوە، ژمارەیان ئێجگار زۆرە و بەردەوامیش لە زیادبووندان.

ئەوەش ڕوونە کە کوالێتی نووسینی ئەم جۆرە بەرهەمانە وەک یەک نییە، لەگەڵ

ئەوەی بەشێکی زۆریان ڕەچاوی بابەتی ئەدەبیان نەکردووە لە نووسینەوەدا، بەڵام بەشێکیشیان لەسەر بنەمای مۆدێرن و چۆنیەتی نووسینەوەی ژیاننامە نووسراون، لەنێو ئەوانەشدا بەرهەمی دیاری توێژینەوە، یان زنجیرە بڵاوکراوەکانی کە شێوازی داستانی نین، پێگەیەکی دیاریان بۆ خۆیان پەیدا کردووە. لە دیارترینی ئەو کتێبانەش دەتوانین ئاماژە بکەین بە: (خاطرات علم، معمای هویدا لە نووسینی عباس میلانی، لولیتا خوانی در تهران لە نووسینی ئازەر نەفیسی، داد و بیداد لە نووسینی ویدا حاجبی، پرسپۆلیس لە نووسینی مەرجان ساتراپی، زندانی تهران لە نووسینی مارینا نمت و کتێبی (دا) خاطرات سیده زهرا حوسەینی لە نووسینی سەیدە ئەعزەم حوسێنی).

ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە بەهۆی ئەو گۆڕانکارییانەی لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا لە سەدەی بیستدا ڕوویانداوە، شێوازی ژیاننامەنووسیش گۆڕانی دیاری بەسەردا هاتووە، سەرباری فراوانبوونی شەپۆلێکی بەهێزی ژیاننامەنووسی، پێویست بوو کە ئاماژە بەو ژیاننامانە بکرێت کە لەلایەن خەڵکەوە دەخوێندرێنەوە، بەڵام هیچ بەهایەکی ئەدەبییان نییە، ئەم جۆرە ژیاننامانەش لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە کە ژمارەیەکی زۆری ژیاننامە بخرێنە بەردەستی خوێنەر بە ئامانجی گەیشتن بە وەڵامێک بۆ ئەو پرسیارە گشتییەی کە هەیانە، ئەمانەش هەر بەو ئامانجە ڕەوانەی بازاڕ دەکرێن هەتا لە کتێب فرۆشییەکان و کتێبخانەکاندا، لە کەناری ژیاننامە بەنرخەکان و بەرهەمە ئەدەبییەکانەوە دابنرێن و پێشکەش بە خوێنەر بکرێن.

یەکێکی دیکە لەو گۆڕانکارییە بەرچاوانەی کە لە سەدەی بیستدا ڕوودەدات، بریتییە لە دەرکەوتنی ژنان لە نووسینەوەی ژیاننامە و ئامادەیی زۆری ژنانە لە ژیاننامەنووسیدا، کە بێگومان ئەمەش پەیوەندیدارە بە فراوانبوونی هزری فێمێنیستەوە.

یەکێک لە تایبەتمەندییە ڕوونەکانی ژیاننامەنووسی لەم قۆناغەدا، بریتییە لە گۆڕانکاریی و جۆراوجۆری شێوازی نووسین و چوارچێوەی خستنەڕووی ژیاننامەکان، کە بەپێی پێشکەوتنە هونەرییەکان ئەنجام دەدرێن و زەمینەی دروستبوونی چەندین جۆری جیاوازی ژیاننامەنووسی فەراهەم دەکات. تەنانەت ڕاگەیاندنەکانیش ڕۆڵی خۆیان تێدا دیوە وەک: سینەما و تەلەفزیۆنەکان، کە بە پێشکەشکردنی فیلمی بەڵگەنامەیی و دۆکیۆمێنتاری دەربارەی کەسانی ناوداری

مێژوویی، ئەدەبی، هونەری و تەنانەت ڕوخسارە نوێکانیش، ڕوخسارێکی نوێیان بە ژیاننامەنووسی بەخشیوە، تا بگاتە ئەوەی کە تەلەفزیۆنەکان گرنگییەکی زۆر بە ئەم بابەتە بدەن، تەنانەت کەناڵی تایبەت بە سەرگوزەشتە، مێژوو، گێڕانەوەی ژیاننامەکان، هەندێک جاریش ئەو بەرنامانە دەنووسرێنەوە و تۆمار دەکرێن. هەندێک جاریش بۆ بابەتی ئابووریی و گەرمکردنی بازاڕی فیلمە پڕسوودەکان و پڕفرۆشەکانە، بەتایبەت فیلمە دۆکیۆمێنتارییەکان لەبارەی ژیاننامەی کەسانی ناودارەوە، هەمیشە بازاڕیان گەرمە.

جۆرێکی دیکە کە زیاتر لە ئێستەدا باوە دەچێتە چوارچێوەی گفتوگۆ و چاوپێکەوتنەوە، لەبری باسکردنی زیاتری ڕووداوەکان و ژیانی تایبەتی کەسەکان، زیاتر چوارچێوەیەک فراوان لە سروشت و کەسایەتی ئەو کەسە دەخاتە ڕوو. هەروەها فراوانبوونی پرۆژەکانی مێژووی زارەکی، جۆرێکی دیکەن لە نووسینەوەی ژیاننامە بەشێوەیەکی مۆدێرن، کە بەشێکی زۆر لەم مێژووی زارەکییە لە ئێستادا دەتواندرێت لە چەند ناوەندێکی ڕاگەیاندن و بە شێوازی سیدی یان کاسێت، کە بە شێوەیەکی فراوان لە کەناڵە جیهانییەکاندا بوونیان هەیە، بەشێوەی دەق و ڤیدیۆ پەیدا بکرێن.

## پەراوێز

١. ئەحمەد ئەشرەف لە توێژینەوەکانی خۆیدا لەمبارەیەوە (کە لە بڵاوکراوەی ئێراننامە دا بڵاو کراوەتەوە)، باس لە جیاوازیەکانی ژیاننامەنووسی دانپێدانانەکانی ڕۆژئاواییەکان لەگەڵ گێڕانەوەی خود (حدیث نفس) لە فەرهەنگی ئیسلامی – ئێرانی دەکات، ئەم بابەتە لە تێڕوانینی یەکەمیانەوە بە دانپێدانان بە تاوان و لە تێڕوانینی دووەمیشدا بە ژیان و ڕەفتاری عیرفان یان بازدان لە شەرعەتەوە بۆ تەریقەت و حەقیقەت، دەبینێت. هەروەها دوایت رینولدز (Dwight F. Reynolds) مامۆستای خوێندنی ئاینی لە زانکۆی کالیفۆرنیا، لە پێشەکی کتێبەکەیدا (وەرگێڕانی خۆد: ژیاننامەنووسی خود لە سوننەتی ئەدەبی زمانی عەرەبی) و لەسەر بنەمای ئەوەی کە جەلالەدینی سیوتی لە پێشەکی ژیاننامەنووسی خودیەکەیدا (التحدث بنعمە الله لە سەدەی ١٥ زاینی) ڕوونی دەکاتەوە، باس لە جیاوازی میتۆدی سیوتی و پەیڕەوانی میتۆدەکەی لەگەڵ نووسەرە ڕۆژئاواییەکان کە ژیاننامەنووسی خود دەنووسن، دەکات. رینولدۆ دەڵێت: لەکاتێکدا کە بەشێک لە ژیاننامەنووسە خودیەکانی ئەوروپییەکان لە سەدەکانی ناوەڕاست و قۆناغی پێش مۆدێرن، ڕونکەرەوەی ئاراستەیی دانپێدانانن بە ئامانجی ئاشکراکردنی گوناە و تاوانی نووسەر لەبەرامبەر دیدگای ئەوانی دیکەدا. ئەوەی کە لە ژیاننامەنووسی لە زمانی عەرەبی دا ڕوودەدات کە سیوتی یەکێکە لە نموونەکان، ئامانج لە نووسین، سوپاسگوزاری نیعمەتی ئیلاهی و پێشکەشکردنی سەرمەشقێک لە ژیانێکی باڵادا یە. بە واتایەکی ڕوونتر، لەکاتێکدا کە گرووپی یەکەم شەرمەزاری گوناە، تاوان و کەمکوڕیەکانی خودی نووسەری ژیاننامەنووسی خودی یە، گرووپی دووەم باس لە سەربڵندی نووسەر و هەبوونی ژیانێکی نموونەیی دەکات کە دەبێت لەلایەن جیلی ئایندەوە لاسایی بکرێتەوە، بە هەمان ئەو شێوەیەی کە ئامانج لە گواستنەوە و گێڕانەوەی ڕیوایات و فەرمودەکانیش، پێشکەشکردنی سەرمەشق و ڕێبەرێک بوو لە ژیانی پێغەمبەر (د، خ).

٢. نموونەیەکی دیاری ئەم جۆرە کتێبانەش، کتێبی مێژووی هاوچەرخ یان ژیانی یەحیا یە کە دوتوێی چوار بەرگدا بڵاو چاپ و بڵاو کراوەتەوە، نووسەر (یەحیا دەوڵەت ئابادی) لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەدا، باس لە ژیانی منداڵی و لاوێتی و تێپەڕاندنی قۆناغەکانی خوێندنی خۆی دەکات.

٣. رینولدز لە کتێبی (در نخستین یادداشت/ لە یەکەم یادداشت دا)، بە جەجتکردنەوە لەسەر جیاوازی سەرچاوەکانی ژیاننامەنووسی ئەوروپی لەگەڵ گێڕانەوەی خود (حدیث نفس) ی عەرەبی، ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ژیاننامەنووسی بە زمانی عەرەبی، لە پێش سەدەی بیست، بەشێوەی پرسیار و وەڵامی مێژوییە، ئەمە لەکاتێکدایە کە لە ڕۆژئاوا، ژیاننامە نووسی لەدوای ڕۆمانەوەیە دێت کە وەک ژانەرێکی ئەدەبی پێگە و شوێنی خوی گرتووە و خواستێکی فراوانی لەسەر هەیە. بەواتایەکی دیکە، رینولدز بڕوای وایە کە بەرهەمە داستانییەکان لە ڕۆژئاوا، پێشەنگ بوون لە پێشخستن و شکڵگرتنی چەمک و واتا ئەدەبیەکاندا.




# تەفسیری هاوێر

## بۆ هەموو ماڵێك، بۆ هەموو ئاستێك

لەنێو ئەو وەرگێڕان و تەفسیرانەی قورئانی پیرۆز بەزمانی کوردی تەفسریی هاوێر دەبێتە میوانێکی نوێی کتێبخانەی کوردی، هەریەک لەو تەفسیرانەی پیشتر هەبوون تام و چێژی خۆیان هەیە، بەڵام کتێبخانەی کوردیی، پێویستی بە تەفسیرێک بوو بە کوردییەکی ڕەوانی متوربەکراو بە لەهجەی پاراوی موکریانیی نوسرابێت، (تەفسیری هاوێر) ئەو پێویستیە دابین دەکات، لەلێکدانەوەی واتای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا پشتی بە تەفسیرە کوردی و عەرەبی و فارسییە هەرە دیارەکان بەستوە و، بێ بواردنی هیچ وشە و تەعبیرێکی قورئان، مانای ئایەتەکان بە کوردییەکی باڵا و سەرنج ڕاکێش دەخاتەڕوو، بەتەواویی خاڵبەندیی تێدا ڕەچاو کراوە و، هاوکات دڵ و هۆشی خوێنەر دەدوێنێ، چەندی بڵێی ڕازاوە خۆی دەنوێنێ.

تەفسیری هاوێر بەرهەمی ئەزموونی دەوڵەمەندی (مامۆستا مستەفا سەید مینە و مامۆستا ڕەوا کاکەڕەش سەید مینە)یە و لەلایەن ڕێکخراوی خاڵ بۆ هزرو ڕۆشنبیری چاپ کراوە.

# هونەری ژیانسازی

## لە ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ

چوار لایەنی جیاوازی ژیانی پێغەمبەر ﷺ لە دووتوێی چوار بەرگی ڕازاوە و بە وەرگێڕانێکی ناوازەوە ئێستا بەردەستە

**بۆ داواکردن پەیوەندی بکەن بە:**

**07701916320**










